# ڕێساکانی فیقهی ئیسلامی

نووسینی:
پرۆفیسۆر د. خالید موحەممەد ساڵح

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درود و ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام و یار و یاوەران و شوێنکەوتوانی بە گشتی.

بەڕێزان زانستی ڕێسا فیقهییەکان یەکێکە لەو زانستە گرنگانەی کە بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرێك لە فێرخوازانی زانستە شەرعییەکان لێی بێ ئاگان و شتێکی ئەوتۆی لەبارەوە نازانن، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەم زانستە ڕۆڵێکی زۆر گەورە دەبینێت لە کۆکردنەوە کورتکردنەوە و ڕیزبەندکردنی بابەتە فیقهییە هەمە جۆر و جیاوازەکاندا و لەقاڵبدانیان لە دوو توێی چەند دەقێکی کورت و پوخت و ڕەواندا.

مێژووی نوسینەوەی ئەم زانستە وەك سەرجەم زانستە شەرعییەکانی تر، دەگەڕێتەوە بۆ پاش کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ و تەواوبوونی سەدەی یەکەمی کۆچی؛ چونکە لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵاندا هیچ کام لەم زانستە شەرعییانەی ئەمڕۆ لەبەردەستدا هەن بەم شێوەیە بوونیان نەبوە و پۆلێن نەکراون وەك زانستێکی تایبەت و سەربەخۆ، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی کاریان پێ کراوە و ڕەنگدانەوەیان هەبووە لە کۆی بابەتە فیقهییەکاندا، هەر بۆیە لەو سەردەمانەدا زانستێك نەبووە بە ناوی بیروباوەڕ یان فیقە یان تەفسیر یان فەرموودە، بەڵام دواتر و هەنگاو بەهەنگاو و بەپێی پێداویستی ژیانی خەڵکی و کۆمەڵگەکان زانایان دارشتنەوەیان بۆ کۆی زانستە شەرعییەکان کردوە و هەریەکەیان بەپێی بابەتی خۆی پۆلێن کردوە و لێکیان جیاکردونەتەوە.

زانستی ڕێسا فیقهییەکانیش یەکێك بووە لەو زانستانەی کە پاش چەندین سەدە لە کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ و بەچەندین قۆناغ نووسینەوە و دارشتنەوەی بۆ کراوە ﷺ تا بۆتە زانستێکی سەربەخۆ و سەرەکی لەنێوان زانستە شەرعییەکاندا.

بەشێوەیەکی گشتی نووسینەوەی زانستی ڕێسا فیقهییەکان بە سێ قۆناغدا تێپەڕ بووە کە ئەمانەن:

قۆناغی یەکەم: دامەزران و دروست بوون (النشوء والتكوين):

لەم قۆناغەدا ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت هاتنە بوون کە دواتر بوونە سەرچاوەی ئیلهام بۆ زانایان و لە ژێر ڕۆشنایی ئەو دەقانەدا زانستی ڕێسا فیقهییەکانیان هاتە بوون و دارِشتنەوەی بۆ کرا. وەك ئایەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾. (سورة البقرة: ٢٨٦). واتە: خوای گەورە داوای هیچ کارێك لە هیچ کەس ناکات ئەگەر لەتوانیدا نەبێت. وە ئایەتی: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾. (سورة المائدة: ٧). واتە: هەر کەس ناچار بوو بە خواردنی گۆشتی حەرام وە برسییەتی زۆری بۆ هێنا بەبێ ئەوەی مەبەستی لادان و تاوانی هەبێت، یان زیادە ڕەوی لەخواردنیدا بکات ئەو کات خوای گەورە زاتێکی لێبووردە و بەخشندە و میهرەبانە و ئەو کارەی بەتاوان لەسەر ئەژمار ناکات. وە ئایەتی: ﴿وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾. (سورة المائدة:٤٥). واتە: تۆڵە کردنەوە لە برینەکانیشدا هەیە. وە ئایەتی: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾. (سورة الشورى: ٤٠). واتە: سزای هەر تاوانێك بە هێندەی قەبارەی تاوانەکە خۆیەتی. وە فەرموودەی: {إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ}. (رواه البخاري). واتە: هەموو کردەوەیەکی مرۆڤ بەپێی نییەت و مەبەستی خاوەنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. وە فەرموودەی: {كُلُّ شَرْطٍ خَالَفَ كِتَابَ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ}. (رواه البخاري). واتە: هەر مەرجێك لە گرێبەست و مامەڵەکاندا پێچەوانەی دەقێکی شەرعی بێت بەتاڵە و دروست نییە. وە دەفەرموێت: {لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ}. (رواه إبن ماجة والبيهقي).واتە: هیچ کەسێك بۆی نییە زیان لە کەسێکی تر بدات و زیانیش بە زیان چارەسەر نابێت.

ئەمانە و سەدەها دەقی تر کە دواتر هەموویان بوونە ڕێسای فیقهی و بەردی بناغەی زانستی ڕێسا فیقهییەکان.

قۆناغی دووەم: گەشەکردنو دارِشتن (مرحلة النمو والتدوين):

ئەم قۆناغە لەسەدەی چواری کۆچییەوە دەستی پێ کرد، کاتێك (ئەبو طاهیری دەبباس) کە یەکێکە لە زانایانی مەزهەبی حەنەفی هەستا بە کۆکردنەوەی گرنگترین ڕێسا فیقهییەکانی مەزهەبی حەنەفی و لە (١٧) ڕێسادا کورتی کردەوە.

ئەم پیاوە پیاوێکی نابینا بووە و پیشەی پێشنوێژی و وتاربێژی بووە و شەوانە پاش نوێژی عیشا کاتێك نوێژخوێنان دەرۆشتنەوە بۆ ماڵ و مزگەوت چوڵ دەبوو، ئەم لە مزگەوتەکەی دەمایەوە و لەبەر خۆیەوە ئەم بنەما و ڕێسایانەی دەگوتەوە و بەردەوام

لێکدانەوە و بەراوردی پێ دەکردن تا بزانێت چ جیاوازییەکیان لە نێواندا هەیە و تا چەند گونجاوە بکرێنە ڕێسای گشتی.

پاش ئەو پیاوێکی تر بەناوی (کەرخی) کە ئەویش هەر زانایەکی حەنەفی مەزهەب بووە و هاو تەمەنی (ئەبو طاهیر) بووە و سوودێکی زۆری لە ڕێساکانی (ئەبو طاهیر) بینیوە، یەکەم پەڕتووکی لەم بوارەدا نووسی و تێیدا (٣٧) ڕێسای فیقهی کۆکردەوە.

دواتر زانایانی سەرجەم مەزهەبەکانی تریش دەستیان کرد بەگەڕان و پشکنین بە شوێن ڕێسا فیقهییەکانی مەزهەبەکانیاندا ، تا ئەم زانستە تەواو گەشەی کرد و پەرەی سەند و بووە زانستێکی سەربەخۆ و دەیەها پەڕتووکی لەسەر نوسرا، تا سەدەی هەشتی کۆچی، کە بەسەردەمی زێڕینی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئەم زانستە ئەژمار دەکرێت.

سێیەم: قۆناغی تەواو بوون و سەقام گیر بوون:

سەرەتای ئەم قۆناغە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی سیازدەی کۆچی و سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتان (عەبدولعەزیز خان) دەگەڕێتەوە، کاتێك سوڵتان کەسێك بە ناوی (احمد جودت آغا)ی ڕاسپارد کە سەرپەرشتی دەرکردنی گۆڤاری (الأحكام العدلية) بکات و ئەویش حەوت کەس لە هەرە زانا بلیمەت و ناودارەکانی ئەو سەردەمەی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەو کارە ڕاسپارد تا گۆڤارەکە دەربکەن، ئەو حەوت پیاوە توانیان (٩٩) لەو ڕێسا فیقهییانەی کە زانایان تا ئەو کاتە پێی گەیشتبون کۆبکەنەوە و لە سەرەتای گۆڤارەکەدا تۆماری بکەن تا لە دادگاکاندا کاری پی بکرێت و ئەو ڕێسایانەی ئەوان لەو سەردەمەدا تۆمار کران تا ئێستایش لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا و لەیاسا و دادگاکاندا کاریان پێ دەکرێت و بەدەرکردنی ئەو گۆڤارە ئەم زانستە جێگیر و سەقامگیر بوو.

بیرۆکەی نووسینی ئەم پەڕتووکەی بەندەیش لە ئێستادا لەوەوە سەری هەڵدا کە کاتێك ئینستتیوتی ژیار پەیمانگەی پێگەیاندنی بانگخوازانی دامەزراند، یەکێك لەو بابەتە زانستییانەی کە بۆ خوێندن لە پەیمانگەکە دانرا بابەتی (ڕێسا فیقهییەکان) بوو، وە ئەرکی گوتنەوەی بابەتەکەیش بەمن سپێردرا، بەندەیش پاش گەڕانێکی زۆر هیچ سەرچاوەیەکی زانستی ئەوتۆم بەزمانی کوردی دەست نەکەوت لەسەر بابەتەکە تا بیکەینە مەنهەج و خوێندکارە بەڕێزەکان سوودی لێ ببینن، بۆیە بڕیارمدا پەڕتوکێکی لەسەر بنووسم، تا ئەو

کەلێنە زانستییەی کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە و ببێتە بنەما و سەرچاوە بۆ ئەو زانستە شەرعییە گرنگە و خوێنکارانی کورد لێی بەهرەمەند بن.

هەر چەندە بابەتەکانی ئەم زانستە و ڕێساکانی زۆر ورد و بڵاون؛ بەڵام من ئەو پەڕی هەوڵم داوە کە لێرەدا و بەپێی ئەو کاتەی کە بۆ خوێندنی پەیمانگەکە و گوتنەوەی بابەتەکە تەرخان کراوە، گرنگترین و سەرەکیترینی ئەو ڕێسایانە باس بکەم کە لەکۆی بابەتە شەرعییەکاندا بوون و ڕەنگدانەوەیان هەیە، بۆ زیاتر سادەکردنەوەی بابەتەکانیش و تا زۆرینەی خەڵکی لێی بەهرەمەند بێت، هەوڵم داوە بەزمانێکی زانستییانە و سەردەمیانەی و ئاسان قسە لەسەر بابەتەکان بکەم و خۆم خوێندکاریش لەهەر بابەتێك بەدوور بگرم کە ڕاجیای و ناڕوونی تێدا بێت و ئەگەریش هەبوو بێت هەوڵم داوە کام بۆچونەیان پەسەندە و بەڵگەکانی بەهێزترە و لەگەڵ سەردەمی ئەمڕۆ گونجاوترە ئەوەیان بخەمە ڕوو، بۆ هەر ڕێسایەکیش کە باسم کردوە سەرەتا پێناسەم کردوە و دواتر قسەم لەسەر گرنگی کاریگەرییەکەی کردوە و پاش ئەویش باسم لەسەرچاوە و بنەما شەرعییەکەی کردوە و لەکۆتاییشدا کۆمەڵێك نموونەی زیندوم لەسەر باس کردوە، ئەمە جگە لە هەندێك وردەکاری تر کە ئەگەر پێویستی کردبێت لەسەر ڕێساکان باسم کردون.

بەشێوەیەکی گشتی و بەپێی ئەو میتۆدەی کەباسم کرد پەڕتووکەکە (٧٧) ڕێسای فیقهی و زیاتر لە (٥٣٥) حوکمی شەرعی لەخۆ دەگرێت.

پ.د. خالید موحەممەد ساڵح

١٢/ شەعبان/١٤٤٢- ٢٠٢١/٣/٢٥

ڕۆژی پێنج شەممە کاتژمێر (٨) و (١٠) خولەکی سەر لەبەیانی.

بەکرەجۆی تازە/ هەواری زانکۆ

## پێناسە:

ڕێسا فیقهییەکان (القواعد الفقهية) دەستەواژەیەکە لە دوو وشە پێك دێت:

**یەکەم: (القواعد):**

کۆی وشەی (قاعدة) یە و لە زمانەوانییدا: بەواتای ڕێسا و بنچینە دێت، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ﴾. (البقرة: ١٢٧). واتە: کاتێك ئیبراهیم و ئیسماعیل بنەما و بنچینەکانی کەعبەیان بەرز دەکردەوە.

لە زاراوەیشدا: (قاعدة) بریتییە لە ڕێسایەکی گشتی کە بەسەر هەموو وردەکارییە هاوشێوە و لەیەکچووەکانیدا جێبەجێ دەبێت، یان بریتییە لە ڕێسایەکی گشتی کە دەکرێت بەهۆیەوە هەموو وردەکارییەکانی بناسینەوە، بۆ نمونە کاتێك دەڵێین: (الأمر للوجوب). واتە: فەرمان کردن بە کردنی کارێك یان شتێك بۆ پێویستکردنی ئەو کارە یان ئەو شتەیە، ئەم ڕێسایە ڕێسایەکی گشتگیرە و هەموو فەرمانە شەرعییەکان دەگرێتەوە بێ جیاوازی.

**دووەم: (الفقه):**

لە زمانەوانییدا: بە واتای تێگەیشتن دێت.

لە زاراوەیشدا بەواتای: زانینی ئەو حوکمە شەرعییە کردارییانە دێت کە لە دانە دانەی بەڵگە شەرعییەکانەوە دەستمان دەکەون، بۆ نمونە: کاتێك دەڵێین نوێژ یان ڕۆژو یان حەج واجب و فەرزە، دەبێت یەکە بەیەکەی ئەو بەڵگە شەرعییانە بزانین کە ئەم پەرستشانەیان واجب کردوە. کاتێکیش دەڵێین دزی حەرامە بەهەمان شێوە دەبێت بەڵگە شەرعییەکانی حەرامبوونەکەی بزانین و تەنها ئەوەندە بەس نییە کە بڵێین حوکمەکەی لە قورئاندا هاتوە بەڵکو دەبێت ئەو دەقە تایبەتە بزانین کە لەسەر ئەو بابەتە هاتوە.

## جیاوازی نێوان ڕێسا فیقهییەكان (القواعد الفقهية) و بنەماكانی فیقه (أصول الفقه):

ئەم دوو دەستەواژەیە هەرچەندە لە ڕواڵەتدا لەیەك دەچن بەڵام لە ناوەڕۆكدا دوو واتەی تەواو پێچەوانە و دژ بەیەكیان هەیە؛ چونكە ڕێسا فیقهییەكان كاریان كۆكردنەوەی هەموو وردەكارییە فیقهییە لەیەكچووەكان و دارشتنەوەیانە لە ڕێسایەكی گشتییدا، بەڵام ڕێساكانی فیقه كاریان شیكردنەوە و وردكردنەوەی بەڵگە گشتییەكان و جێبەجێ كردنیانە بەسەر وردەكارییە فیقهییەكاندا.

### بنەماكانی ڕێسا فیقهییەكان:

بۆ هەر بابەت یان دەقێك كە بمانەوێت بیكەینە ڕێسایەكی فیقهی، پێویستە كۆمەڵێك بنەما و ڕاگری هەبێت تا بتوانرێت لەسەریان دامەزراو و سەقامگیر بێت، ئەو بنەما و ڕاگرانەیش بریتین لە:

یەكەم: گشتگیری: واتە هەر ڕێسایەكی فیقهی كە دادەڕێژرێت پێویستە گشتگیر بێت و هەموو ئەو وردەكارییە فیقهییانە لەخۆ بگرێت كە دەچنە ژێر ئەو ڕێسایەوە، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ﴾. (الأعراف: ١٥٧). واتە: ئەو پێغەمبەرەی ﷺ كە شتە باشەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات و شتە خراپ و زیان بەخشەكانیان لێ قەدەغە و یاساغ دەكات. ئەم دەقە دوو ڕێسای سەرەكی لەخۆ دەگرێت:

١- هەموو شتە باش و بەسوودەكان حەڵاڵ و ڕێگەپێدراون.

٢- هەموو شتە زیان بەخش و بێ سوودەكان قەدەغە و یاساغن.

ئەم دوو ڕێسایە هەموو حوكمە شەرعییەكانی پەیوەست بەسەرجەم كایەكانی ژیان دەگرێتەوە و هیچ شتێكی لێ هەڵاوێرد نەكراوە؛ بۆیە دەكرێت وەك دوو ڕێسای فیقهی مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێت.

دووەم: پەتی بوون: واتە نابێت ڕێساكە تایبەت بێت بە باتەێكی فیقهی دیاریكراوەوە، بۆ نموونە بڵێین: (بەزۆر تەڵاق ناكەوێت) یان (ڕۆژو بەبێ نییەت دروست نییە) یان (ناچاری گۆشتی حەرام حەڵاڵ دەكات). ئێستا هیچ كام لەم نموونانە ناكرێت وەك ڕێسای

فیقهی مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت؛ چونكە هەر یەكەیان تایبەتە بە بابەتێكی فیقهی دیاریكراوەوە، یەكێكیان بە تەڵاق و یەكێكیان بە ڕۆژو یەكێكیان بە خواردن و ڕێسای فیقهیش ناكرێت تایبەت بێت بە بابەتێكی دیاریكراوەوە و دەبێت گشتگیر و پەتی بێت؛ بەڵام ئەگەر گوتمان: (هیچ كردەوەیەكی مرۆڤ بە زۆر دروست نییە) یان (هیچ كردەوەیەكی مرۆڤ بە بێ نییەت دروست نییە و وەرناگیرێت) یان (ناچاری حەرامەكان حەڵاڵ دەكەن). ئەو كات دەكرێت پێیان بگوترێت ڕێسای فیقهی.

سێیەم: جێگیری و بەردەوامی: واتە پێویستە ڕێساكە پشت بە یاسایەكی دیاریكراو و زانراو ببەستێت و بەهۆی ئەو یاسایەوە بە ئاسانی بناسرێتەوە.

ئەم بابەتە لەبەشی (إثبات) دا پێی دەگوترێت (إطراد) واتە لەگەڵ یەكبوون و لە (نفي) دا پێی دەگوترێت (إنعكاس) واتە پێچەوانەبوونەوە، بۆ نموونە كەدەڵێین: هەموو خواردنەوەیەكی سەرخۆشكەر حەرامە. ئەمە بنەمایەكی یاسایی و زانستیی دیار و زانراوە و هەر خواردنەوەیەك ئەو سیفەتەی تێدا بێت خواردنەوە و مامەڵەپێكردنی حەرامە و یاساغە و ڕێسا فیقهییەكان پێویستە یاسای لەو جۆرەیان هەبێت كە بەهۆیەوە بناسرێنەوە.

## تەواوكاری ڕێسا فیقهییەكان:

جگە لەو سێ پایە و بنەما بابەتییانەی كە باسمان كرد سێ خاڵی ترهەن كە دەبنە تەواوكاری ڕێسا فیقهییەكان و هێز و جوانی و ڕێكییان پێ دەبەخشن و ئەگەریش نەبن كێشەیەك بۆ ڕێساكە دروست ناكەن و لەكاری ناخەن، ئەو خاڵانەیش بریتین لە:

یەكەم: كورتی (الإیجاز): واتە تا دەكرێت ڕێساكە كورت و پوخت بێت و لە دوو وشە یان چەند وشەیەكی دیاریكراو تێپەڕ نەكات، هەر وەك ڕێساكانی: (لا ضرر و لا ضرار)، (الأمور بمقاصدها)، (المفرط ضامن)، (العادة محكمة)، (لاتكلیف إلا بمقدور).

ئەمەیش لە پێناو ئەوەی كە تێگەیشتن و لەبەر كردن و ناسینەوە و جێبەجێ كردنی بۆ هەموو خەڵكی ئاسان بێت.

دووەم: ڕوونی (الوضوح): واتە ڕێساكە ڕوون و ئاشكرا بێت، ئەمەیش تەواوكاری خاڵی یەكەمە و ئامانج لێی ئەوەیە كە نابێت كورتی ڕێساكە كاریگەری لەسەر ڕوونی واتاكەی

دروست بکات و ئاڵۆزی بکات؛ کەواتە سەرەڕای کورتی وشەکانی پێویستە واتاکەی ڕوون و دیار بێت و هیچ ئاڵۆزی تێدا نەبێت.

**سێیەم: هەبوون و بەرجەستەبوون (الواقعية):** واتە پێویستە ڕێساکە لە واقیعدا بوونی هەبێت و بەسەر چەندین وردەکاری فیقهیدا جێبەجێ بکرێت، خۆ ئەگەریش ڕێساکە تەنها تیۆری بێت و هیچ نموونەیەکی فیقهی بەرجەستەی نەبێت کە بەسەریدا جێبەجێ بکرێت ئەو کات پێی ناگوترێت ڕێسای فیقهی.

## سەرچاوەکانی ڕێسا فیقهییەکان:

هەموو سەرچاوەکانی حوکمی شەرعی دەبنە سەرچاوە بۆ ڕێسا فیقهییەکانیش لەوانە: قورئان، سوننەت، کۆدەنگی زانایان (إجماع)، قیاس و هتد بۆ نموونە:

- ڕێسای (الأمور بمقاصدها). واتە: هەر کارێك بە پێی مەبەستی خاوەنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. دەقاودەق لەو ئایەتە وەرگیراوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿واللَّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ﴾. (سورة البقرة: ٢٢٠). واتە: خوای گەورە خۆی ئاگادار و زانایە بەوەی کە کێ مەبەستی باش و چاکە و کێیش مەبەستی خراپە. وە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: {إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ}. (رواه البخاري). واتە: هەموو کردەوەیەکی مرۆڤ بەپێی نییەت و مەبەستی خاوەنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

- ڕێساکانی: (الأصل براءة الذمة). واتە: لە بنەڕەتدا هیچ کەس مافی بەسەر کەسێکی ترەوە نییە.

- (اليقين لا يزال بالشك). واتە: دڵنیایی بە گومان لاناچێت.

- (الأصل في الأشياء الإباحة). واتە: هەموو شتێك لەبنەڕتدا ڕێگەپێدراوە.

هەموو ئەمانە لە سەچاوەی (استصحاب) ە وە وەرگیراون ئەو سەرچاوەیەیش لەو فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە کە دەفەرموێت: {الْبَيِّنَةُ عَلَى مَنِ ادَّعَى}. واتە: ئەو کەسەی داوای مافێك لەکەسێکی تر دەکات پێویستە بەڵگەی پێ بێت؛ چونکە لە بنەڕەتدا هیچ کەس مافی بەسەر کەسەوە نییە تا بەبەڵگە پشتڕاستی نەکاتەوە.

- ڕێسای (مقاطع الحقوق عند الشروط). واتە: سنووری مافەكان تا بوونی مەرجەكانە. ئەم ڕێسایە لە دەقی قسەیەكی پێشەوا عومەرەوە وەرگیراوە.

هەندێك جاریش ئەگەر دەقێكی ڕوون لەسەر بابەتەكە نەبوبێت، زانایان لە دەرەنجامی تێڕوانین و وردبونەوە لە كۆی دەقە شەرعییەكان و سەرچاوەكانی حوكمی شەرعی ڕێسایەكیان دارشتووە، بۆنموونە:

- ڕێسای: (لا اجتهاد فی مورد النص). واتە: هەر بابەتێك دەقی شەرعی لەسەر هەبوو، هیچ كەس بۆی نییە بە بۆچونی خۆی كاری پێ بكات؛ بەڵكو پێویستە پابەند بێت بەدەقەكەوە. هەرچەندە ئەم ڕێسایە دەقێكی شەرعی ڕاستەوخۆی لەسەر نەهاتوە؛ بەڵام لەگەڵ كۆی دەقەكانی قورئان و سوننەت یەك دەكاتەوە لەوانە ئایەتی: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾. (سورة الحجرات:١). واتە: ئەی گرۆهی بڕواداران قسە و بۆچونی خۆتان مەخەنە پێش فەرموودەی خوای گەورە و پێغەمبەرەوە ﷺ .

- ڕێسای: (الإجتهاد لا ينقض بالإجتهاد). واتە: ئەگەر لەسەر بابەتێك دەقی شەرعیمان نەبوو، دوو كەسی زانا ئیجتیهادیان كرد و بۆچونی خۆیان لەسەر دا، بۆچونی هیچ كامیان بۆچونی ئەوی تریان هەڵناوەشێنێتەوە و نابێتە بەڵگە لەسەری؛ چونكە ئەگەر وامان كرد ئەو كات تەنها یەك كەس بۆی دەبێت بۆچونی خۆی لەسەر بابەتەكە بدات و سەرجەم زانایانی تر دەبێت پابەندی بۆچونەكەی ئەو بن و بەمەیش بۆچونی ئەو زانایە دەچێتە پێگەی دەقەوە و هەمان هێزی ئەوی دەبێت و كەس بۆی نابێت لێی لا بدات، ئەمەیش كارێكی نەشیاو و ڕێگە پێ نەدراوە؛ هەر بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و زانایان لە سەر چەندین بابەت بۆچونی جیاوازیان هەبووە و هیچ كەسیشیان بەوی تریان نەگوتوە تۆ پێویستە پابەندی بۆچونی من بیت و بۆت نییە بۆچونی جیاوازت هەبێت؛ بگرە بە پێچەوانەوە زۆر ڕێزی بۆچونەكانی یەكتریان گرتوە و كاریشیان پێ كردوە.

بۆنموونە: كاتێك پێشەوا ئەبوبەكر بووە فەرمانڕەوای موسوڵمانان مووچەی هاوەڵانی بەیەكسانی و بێ جیاوازی دابەش دەكرد؛ بەڵام كاتێك پێشەوا عومەر بووە جێنشینی گوتی: من مووچەی كەسێك كە لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ شەڕی كردوە یەكسان ناكەم بەموچەی كەسێك كە دژی پێغەمبەری خودا ﷺ شەڕی كردووە، بۆیە مووچەی هاوەڵانی

دابەش کرد بەسەر چەند ئاستێکدا و مووچەی خۆی و عەبدولای کوڕی لە زۆرێك لەهاوەڵان کەمتر دانا، کاتێك عەبدوللای کوڕی پرسیاری لێ کرد: بۆچی مووچەکەی من لە مووچەی ئوسامەی کوڕی زەید کەمترە؟ پێی گوت: لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئوسامەی لە تۆ خۆشتر دەویست و باوکی ئوسامەیشی لە باوکی تۆ خۆشتر دەویست.

ئەمانە و سەرجەم ڕێسا فیقهییەکانی تر هەموویان بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەسەرچاوەی حوکمە شەرعییەکانەوە وەرگیراون.

## گرنگیی زانستی ڕێسا فیقهییەکان:

ئەم زانستە وەك هەر زانستێکی شەرعی تر گرنگی خۆی هەیە، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ببنە شەرعزانێکی لێزان و سەرکەوتوو، بۆ ڕوونکردنەوە زیاتری ئەم بابەتە ئەم چەند خاڵە لێرەدا دەخەینە ڕوو:

١- هەموو وردەکارییە فیقهییەکان لە چەند ڕێسایەکی سەرەکییدا کۆ دەکاتەوە و جۆرێك لە پەیوەست بوون و تێکەڵکێشی لە نێوان زانستە شەرعییەکاندا دروست دەکات، بەشێوەیەك کە هەرکەس زانیاری دەربارەی ڕێسا فیقهییەکان هەبێت ئەوە بەدڵنیاییەوە زانیاری دەربارەی زۆرێك لە زانستە شەرعییەکان دەبێت و توانای پێکەوە گرێدانیانی دەبێت.

٢- توانای داڕشتن و لەقاڵبدانی بۆچوونە فیقهییە جیاوازەکانمان لا دروست دەکات لە چوارچێوە و دووتوێی کۆمەڵێك دەقی یاسایی ئاساندا بە شێوازێکی بابەتی و سەردەمییانە کە هەموو خەڵکی بتوانن بۆی بگەڕێنەوە و لێی سوودمەند بن؛ چونکە ئەو زمانەی لەو سەردەمانەدا فیقهی ئیسلامی پێ نوسراوەتەوە زمانێکی زۆر قورس و وردە بۆ سەردەمی خۆی نوسراونەتەوە و لە ئێستادا خەڵکی پسپۆڕ و تایبەتمەند نەبێت ناتوانێت لێی تێ بگات.

٣- ئێمە بە هەزارەها پەڕتووکی فیقهیمان هەیە کە دابەش دەبن بەسەر دەیەها مەزهەبی فیقهی و زانستی شەرعییدا و لەهەر یەك لەو پەڕتووکانەدا و لەسەر هەر بابەتێکی فیقهی ورد دەیەها بۆچون هەیە و ئاستەمە خەڵکی سادە بتوانێت لە نێو ئەو

دەریایەدا بۆچونی پەسەند بدۆزێتەوە و هەڵبژێرێت، ئەمەیش وای كردوە كە خەریكە حاڵەتێكی لێك ترازان لە نێوان ئەو كەلتورە فیقهییە و نەوەی نوێدا دروست دەبێت و ئەركی شەرعزانانە لە ژێر ڕۆشنایی ڕێسا فیقهییەكاندا فیقهێكی سەردەمییانە و پەسەند بۆ خەڵكی بنووسنەوە، تا بەر بەو حاڵەتی لێكترازانە بگرن.

٤- لەڕووی یاساییەوە ڕێسا فیقهییەكان خزمەتێكی زۆریان بە یاسا و یاساناسان كردوە و زۆرێك لە ڕێسا فیقهییەكان ڕەنگدانەوەیان هەیە لە یاساكانی زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا، ئەویش بەهۆی ئەوەی كە ئەو ڕێسایانە ڕێگەی زۆر دوور نزیك دەكەنەوە و چەمكی زۆر ئاڵۆز ڕوون دەكەنەوە و هەر كەس لەم بوارەدا شارەزا بێت ئەوە بەدڵنیاییەوە لە داڕشتن و تێگەیشتنی بنەما یاساییەكانیشدا شارەزا دەبێت و ناكەوێتە هەڵەوە؛ چونكە یاسا لە ڕووی بابەتییەوە چەند پێویستی بە تۆكمەییە، لە ڕووی زمانی داڕشتنیشەوە ئەوندە و بگرە زایتریش پێویستی بە تۆكمەییە، شارەزابوون لە ڕێسا فیقهییەكان ئەو دوو زانست و توانایە لای كەسی شەرع زان دروست دەكەن.

ئێستایش و پاش ئەم پێشەكییە لەسەر زانستی ڕێسا فیقهییەكان، دەچینە سەر باسی خودی ڕێساكان و سەرەتا لە ڕێسا گشتییەكانەوە دەست پێ دەكەین.

## ڕێسای یەک

## الأمور بمقاصدها

**واتە:** هەر کارێك بە پێی مەبەستی خاوەنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

**گرنگی:** ئەمە یەکێکە لەو پێنج ڕێسا فیقهییەی کە کۆی حوکمە شەرعییەکانی لەسەر دامەزراوە و زانایان بەکۆی دەنگ کاریان پێ کردوە، گرنگی ئەم ڕێسایە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پەیوەندی بە نیەتەوە هەیە و نیەتیش کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لەسەر سەرجەم بابەتە فیقهییەکان و کردەوەکانی مرۆڤ هەیە؛ هەر بۆیە زانایان دەڵێن: یەك لەسەر سێی هەموو زانستە شەرعییەکان پەیوەستە بەم ڕێسایەوە.

ئیبن قەییم دەربارەی گرنگی ئەم ڕێسایە دەڵێت: **(النية فهي رأس الأمر وعموده وأساسه وأصله الذي يبنى عليه، فإنها روح العمل وقائده وسائقه، والعمل تابع لها، يبنى عليها، ويصح بصحتها ويفسد بفسادها)**. (إعلام الموقعين لابن القيم ٤/١٥٢). واتە: نیەت سەر و کۆڵەکە و بنەمای هەموو کارێکە و ئەو بنچینەیەیە کە لەسەری دادەمەزرێت، هەر ئەویش گیان و پێشەنگ و ڕێ نیشاندەری کردەوەکانە و کردەوەکان وابەستەو شوێنکەوتەی نیەتن ، ئەگەر نیەتی کردنی کردەوەکان باش بێت کردەوەکانیش باش دەبن، ئەگەریش خراپ بێت کردەوەکانیش خراپ دەبن.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایانەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَى إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَى﴾. (سورة الليل: ١٩-٢٠). واتە: ئەو کەسەی کاتێك دەبەخشێت تەنها لە پێناو ڕەزامەندی خوادا دەبەخشێت، نەك لەبەر ئەوەی قەرزی کەسێکی لایە یان منەتی کەسێکی بەسەرەوە بێت.

٢- وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾. (سورة النساء: ١٠٠). واتە: هەر کەسێك لە ماڵەکەی خۆی دەربچێت و کۆچ

بۆ لای خوای گەورە و پێغەمبەر ﷺ بكات و پاشان بمرێت ئەوە پاداشتی دەكەوێتە سەر خوای گەورە.

٣- وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتَغَاء مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عظيما﴾. (سورة النساء: ١١٤). واتە: هەركەسێك ئەو كارە چاكانە لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەدا بكات ئەوانە پاداشتی زۆر گەورەیان دەدەینەوە.

٤- وە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ﴾. (سورة الفتح: ١٨). واتە: خوای گەورە لەو بڕوادارانە ڕازی بوو كە لەژێر دارەكەدا بەیعەت و بەڵێنیان پێ دایت و خوای گەورە ئاگای لە نیاز و مەبەستی دڵیان بوو وبەزەیی و میهرەبانی ڕشت بەسەریاندا.

٥- وە دەفەرموێت: ﴿فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ﴾. (سورة الزمر: ٢). واتە: دڵسۆزانە خوای گەورە بپەرستە.

٦- وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾. (سورة البينة: ٥). واتە: تەنها بەوە فەرمانیان پێكراوە كە دڵسۆزانە خوای گەورە بپەرستن و دینداری بكەن.

سەبارەت بەدەقەكانی سوننەتیش لەسەر نیەت:

٧- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وإنما لكلِّ امرئ ما نوَى}. (رواه البخاري). واتە: هەموو كردەوەیەكی مرۆڤ بەپێی نییەت و مەبەستی خاوەنەكەی مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت و هەركەسێكیش لەقەدەر نیەتەكەی سزا و پاداشتی پێ دەبڕێت.

٨- وە دەفەرموێت ﷺ: {لَا عَمَلَ لِمَنْ لَا نِيَّةَ لَهُ، وَلَا أَجْرَ لِمَنْ لَا حِسْبَةَ لَهُ}. (رواه البيهقي في السنن الكبرى). واتە: هیچ كردەوەیەكی باشی مرۆڤ وەرناگیرێت ئەگەر نییەتی بۆ خوا نەبوبێت، وە هیچ كەسیش پاداشتی كردەوە باشەكانی وەرناگرێت ئەگەر لای خوا ئەژماری نەكردبێت.

٩- وە دەفەرموێت ﷺ: {مَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ جَعَلَ اللَّهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ}. (رواه إبن ماجة في السنن وصححه الألباني). واتە: هەر كەس مەبەستی بەكارەكانی دەستكەوتی دونیا بێت خوای گەورە هەژار و چاو برسی دەكات.

١٠- وە دەفەرمویّت ﷺ: {يغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فإذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وآخِرِهِمْ}. قَالَتْ عائشة : قلتُ : يَا رَسُولَ اللهِ ،كَيْفَ يُخْسَفُ بأوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ وَفِيهِمْ أسْوَاقُهُمْ وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ ؟! قَالَ: {يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيّاتِهِمْ}. (متفق عليه). سوپایەك دێت و دەیەوێت دەست بەسەر كەعبەدا بگرێت و تێكی بدات، كاتێك دەگەنە دەشتاییەك، خوای گەورە هەموو سوپاكە دەبات بە ناخی زەویدا. خاتو عائیشە دەڵێت: چۆن خوای گەورە هەموویان وەك یەك دەبات بە ناخی زەویدا لەكاتێكدا هەندێك لەوانە بۆ بازرگانی هاتوون و هەندێكیش تەنها ڕێبوارن و لەڕێگە لەگەڵیان كەوتون و بەمەبەستی تێكدانی كەعبە نەهاتوون؟!!. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە هەموویان لەناو دەبات، پاشان لە قیامەتدا هەر كەسە و لەسەر نیەتەكەی خۆی زیندوو دەكرێتەوە و هەر بەو پێیەیش مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

ئەمانە و سەدەها دەقی شەرعی تری هاوشێوەی ئەمانە هەن كە جەخت لەسەر گرنگی نیەت دەكەنەوە و بەخاڵی یەكلاكەرەوەی وەرگرتن و ڕەتكردنەوەی كردەوەكانی لە قەڵەم دەدەن و زانایانیش كۆ دەنگن لەسەریان.

هەموو ئەمانەیش پێكەوە دەبنە سەرچاوەی شەرعی ڕێسای (الأمور بمقاصدها).

ڕۆڵ و ئامانج: نیەت سەرەڕای ئەوەی كە باسمان كرد چەقی وەرگرتن و ڕەتكردنەوەی سەرجەم كردەوەكان و دیاری كردنی سزا و پاداشتەكانیانە، ڕۆڵێكی گەورە دەبینێت لە دوو بواردا:

یەكەم: نیەت پەرستش لە داب و نەریتەكان جیا دەكاتەوە، بۆ نموونە:

١- كەسێك هیچ خواردن و خواردنەوەیەك ناخوات، ئێمە نازانین بەڕۆژووە، یان ڕێجیم دەكات، یان نەخۆشە، یان مانی گرتوە، یان برسی نییە.

٢- كەسێك بەدەوری كەعبەدا دەسوڕێتەوە، ئێمە نازانین شتێك یان كەسێكی لێ ون بوە و بەدویدا دەگەڕێت، یان وەرزش دەكات، یان طەواف دەكات.

٣- كەسێك خۆی دەشوات ئێمە نازانین چڵكنە، یان لەشی گرانە، یان تەنها خۆی فێنك دەكاتەوە.

ئەوەی هەموو ئەم ئەگەرانە یەکلا دەکاتەوە نیەتی خاوەنەکەی خۆیەتی کە مەبەست لەکارەکەی پەرستش و ڕەزامەندی خوای گەورە بووە یاخود هەر کارێکی ئاسایی و پێداویستییەکی خۆی بووە.

**دووەم:** نیەت پەرستشەکان لەیەکتر جیا دەکاتەوە. بۆ نموونە:

١- کەسێك بڕێك پارە دەکات بەخێر ئێمە نازانین ئەو پارەیە زەکاتە، یان نەزرە، یان کەفارەتە، یان قەرزە، یان خێرێکی ڕەهایە.

٢- کەسێك بەڕۆژووە ئێمە نازانین ڕۆژووەکەی فەرزە، یان قەرزە، یان نەزرە، یان کەفارەتە.

٣- کەسێك نوێژ دەکات ئێمە نازانین فەرزە، یان سوننەتە، یان نەزرە.

له هەموو ئەمانەیشدا دیسانەوە نییەتی کەسەکە خۆی یەکلای دەکاتەوە.

بەهەمان شێوە له بواری حەرامەکانیشدا نیەت و مەبەستی خاوەنەکەی کاریگەری زۆری هەیە لەسەر سزاو چارەنووسی خاوەنەکەی بۆ نموونە.

١- کەسێکی نابینا کاتێك تێڕوانینی حەرام ناکات، بە پەرستش بۆی ئەژمار ناکرێت، چونکە لە بنەڕەتدا بۆی ناکرێت.

٢- کەسێك زینا ناکات لەبەر ئەوەی پیاوەتی نییە، بە پەرستش بۆی ئەژمار ناکرێت، چونکە ئەگەر مەبەستیشی بێت بیکات بۆی ناکرێت.

٣- کەسێك تاوانێك دەکات نازانێت کە تاوانە و مەبەستی نییە کە تاوان بکات، بەتاوان لەسەری ئەژمار ناکرێت، تەنانەت ئەگەر تاوانەکەی کوفریش بێت؛ چونکە نەیزانیوە کە ئەو کارە کوفرە و مەبەستیشی نەبووە کە کوفر بکات.

لەبەرامبەردا ئەگەر کەسێك کارێك بکات و وا بزانێت حەرامە بەتاوان لەسەری ئەژمار دەکرێت ئەگەر چی کارەکە لەخودی خۆیشیدا تاوان نەبێت؛ چونکە ئەم بەحەرامی زانیوە و مەبەستیشی بووە بە حەرامی ئەنجامی بدات. بۆ نموونە:

١- پیاوێك دەچێتە لای ئافرەتێك بەمەبەستی ئەوەی زینای لەگەڵ بکات، دواتر ئەگەر بۆیشی دەرکەوت کە ئەو ئافرەتە خێزانی خۆی بووە هەر تاوانی زیناکەی بۆ دەنوسرێت، بە پێچەوانەیشەوە ئەگەر بچێتە لای ئافرەتێك و وابزانێت خێزانی خۆیەتی بەڵام دواتر

دەركەوت خێزانی خۆی نەبووە بەزینا بۆی ئەژمار ناكرێت، هەموو ئەمانەیش بە پێی نییەتی كەسەكان دەگۆڕێت.

٢- كەسێك بەمەبەستی ڕاوكردن فیشەك دەنێت بە ئاژەڵێكەوە و بەهەڵە بەر كەسێك دەكەوێت و دەیكوژێت بە بكوژ ئەژمار ناكرێت؛ چونكە مەبەستی نەبووە كەس بكوژێت، بە پێچەوانەوە ئەگەر فیشەك بنێت بەمرۆڤێكەوە بەمەبەستی كوشتن بەڵام بەری نەكەوێت تاوانی مەبەستی كوشتنەكەی لەسەر دەنوسرێت ئەگەر چی كەسەكەیشی نەكوشتبێت؛ هەر بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ لەفەرموودەكەدا دەفەرموێت: {إِذَا التَقَى المُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالقَاتِلُ وَالمَقْتُولُ فِي النَّارِ}. فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا القَاتِلُ فَمَا بَالُ المَقْتُولِ؟! قَالَ: {إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ}. (رواه البخاري ومسلم). واتە: ئەگەر دوو موسوڵمان بەشمشێرەكانیان- بە چەك- ڕوبەڕوی یەكتر بوونەوە، بكوژ و كوژراوەكەیش لە ئاگردایە. ئەو هاوەڵەی فەرموودەكە دەگێڕێتەوە دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە بكوژەكە دیارە بۆ لە ئاگردایە، ئەی كوژراوەكە بۆ؟! فەرمووی: چونكە ئەویش لە بۆسەدا بوو بۆ كوشتنی هاوەڵەكەی.

**مەرجەكانی كارپێكردن:**

نییەت بە كۆمەڵێك مەرج وەردەگیرێت و كاری پێ دەكرێت ئەوانیش بریتین لە:

١- كارەكە پەرستش بێت و پەیوەست بێت بە نێوانی خوای گەورە و بەندەكانی؛ چونكە بۆ یەكلاكردنەوەی زۆرێك لە مامەڵەكانی بەندەكان لە گەڵ یەكتر كار بەنیەتەكانی دڵیان ناكرێت؛ بەڵكو كار بە ڕوكەشی كردەوەكانیان دەكرێت، ئەمەیش بابەتێكی ڕوون و ئاشكرایە وپێویست بە نموونە و بەڵگە ناكات.

٢- كەسەكە زانیاری تەواوی هەبێت دەربارەی ئەو كارەی كە دەیكات، ئەگەر زانیاری نەبوو ئەو كات دیارە مەبەستیشی نییە، یان ئەگەر هەیشی بێت مەبەستەكەی هەڵەیە؛ بۆیە كاری پێ ناكرێت و هیچ شوێنەوارێكیشی لەسەر دروست نابێت؛ هەر وەك ڕێساكە دەڵێت: (النية تتبع العلم). واتە: نیەت وابەستەی زانیارییە و هەر لەسەر ئەو بنەمایەش مامەڵە لەگەڵ خاوەنەكەی دەكرێت، بوونی زانیاریش دەربارەی هەر كارێك دوو شت دەگرێتەوە:

یەکەم: بوونی زانیاری دەربارەی خودی شتەکە کە واتە و مەبەستی چییە.

دووەم: بوونی زانیاری دەربارەی حوکمە شەرعییەکەی و لێکەوتەکانی.

بۆیە ئەگەر کەسێك بە خێزانەکەی گوت تەلاقت کەوتبێت؛ بەلاَم زمانی عەرەبی نەدەزانی یان تازە موسوڵمان بوبو نەیدەزانی واتەی تەلاَق چییە، تەلاَقی ناکەوێت.

یان ئەگەر قسەیەك یان کردەوەیەکی کرد کە لەخودی خۆیدا کوفر بوو بەلاَم ئەو نەیدەزانی کوفرە پێی کافر نابێت؛ چونکە نەیزانیوە و مەبەستیشی نەبووە کوفر بکات. هەر وەك ڕێساکە دەڵێت: (قد یقع الإنسان فی الکفر ولا یقع الکفر علیه). واتە: هەندێك جار مرۆڤ دەکەوێتەوە کوفرەوە بەلاَم کافر نابێت.

دەگێڕنەوە لەسەردەمی پێشەوا عومەردا ژنێك دەیەوێت فێڵ لەمێردەکەی بکات و خۆی پێ تەلاَق بدات، پێی دەڵێت: حەز دەکەم ناوی خۆم بنێم (طالق) واتە: تەلاَقت کەوتبێت، دیارە پیاوەکەش کەسێکی ساویلکە و گێل دەبێت ڕازی دەبێت و دەڵێت کەواتە: (انت طالق) واتە: تۆ تەلاَقت کەوتبێت، ئافرەتەکە دەڵێت ئەوە تەلاَقم کەوت، دەڕوات بۆلای پێشەوا عومەر و دەڵێت: تەلاَقی داوم و دەمەوێت و لێی جیا ببمەوە. پیاوەکەی دەڵێت: قوربان ئەو فێڵی لێکردووم و خۆی وا ناوناوە و بە حساب من ناوم هێناوە، پێشەوا عومەر تەلاَقەکە ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت: تەلاَقت نەکەوتووە؛ چونکە پیاوەکەت کەوای گوتوە مەبەستی نەبووە تەلاَقت بدات، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە ناوت بهێنێت.

٣- نیەتەکە هاوتای کردنی کارەکە بێت: واتە ئەو نیەتە کاری پێ دەکرێت کە لەکاتی کردنی کارەکەدا یان گوتنی قسەکەدا بوونی هەبووە و دواتر هەر گۆڕانکارییەك بەسەر نیەتەکەدا بێت نرخی نییە و ئیشی پێ ناکرێت، بۆنموونە: کەسێك لەگەڵ خێزانەکەی دەبێتە شەڕیان، پێی دەڵێت: لەم ساتەوە تۆ هیچی من نیت، و ئەم قسەیەی بەمەستی تەلاَق پێ دەڵێت، یەکسەر تەلاَقی دەکەوێت دواتر ئەگەر نیەتیشی گۆڕی و گوتی من نامەوێت تەلاَقی بدەم تەلاَقی هەر کەوتووە و گۆڕینی نیەتەکە لەدوای قسەکە هیچ کاریگەری نابێت.

٤- کەسەکە لە نیەتەکەی دڵنیا بێت و هیچ گومانی تێدا نەبێت، خۆ ئەگەر لە نیەتەکەی دوودڵ بوو وە گومانی هەبوو ئەو کات کارەکەی دروست نییە و دانامەزرێت، بۆ نموونە:

- کەسێك دەیەوێت نوێژ بکات بەڵام نازانێت کاتی نوێژەکە هاتووە یان نا، ئەگەر بەگومان نوێژ بکات نوێژەکەی دروست نییە تا تەواو دڵنیا نەبێت لەوەی کاتی نوێژەکە هاتووە، خۆ ئەگەر دواتریش بۆی دەرکەوت کە ئەو کاتەی نوێژەکەی کردوە نوێژەکە کاتی هاتبوو هەر دروست نییە و دەبێت بیکاتەوە؛ چونکە کاتی کردنی نوێژەکە لە کارەکەی بەگومان بووە و نییەتیش لەسەر گومان دانامەزرێت.

- کەسێك نوێژ دەکات بەگومانە لەوەی کە نیەتی نوێژی نیوەڕۆی هێناوە یان عەسر، نوێژەکە بەتاڵە و بری هیچ کامیان ناکەوێت و دەبێت بیکاتەوە.

- کەسێك زەوییەك دەکڕێت و دوو دڵە لەوەی بیکات بە خانوو یان بیفرۆشێتەوە و لەو بەینەدا خۆی بۆ یەکلا نابێتەوە، ئەو زەوییە زەکاتی ناکەوێت تا خۆی یەکلا نەکاتەوە؛ چونکە وەکو گوتمان هیچ کارێك یان پەرستشێك لەسەر گومان دانامەزرێت.

٥- نییەتی کەسەکە ئارەزومەندانە بێت و هیچ زۆری تێدا نەبێت؛ چونکە وەك هەمووان دەزانین هەر کارێك یان گوفتارێك زۆری تێدا بێت دروست نییە و دانامەزرێت، ئەگەر کارەکە ئیمان و کوفریش بێت، هیچیان بەزۆر دانامەزرێن و شوێنەواریشیان لەسەر دروست نابێت؛ چونکە نیەت گوزارشت کردنی کەسەکەیە لە خواست و مەبەستی خۆی نەك کەسێکی تر، لەکاتی زۆریشدا کەسی زۆرلێکراو گوزارشت لەمەبەستی زۆردارەکە دەکات نەك نییەتی دڵی خۆی.

٦- نیەتەکە لەسەرەتای کارەکە تا کۆتاییەکەی بەردەوام بێت و گۆڕین و پچڕانی تێدا دروست نەبێت: بۆ نموونە:

- کەسێك بەڕۆژو بێت تا ئێوارە؛بەڵام پێش بانگی مەغریب نیەت بهێنێت ڕۆژووەکەی بشکێنێت، ڕۆژووەکەی بەتاڵە ئەگەر هیچیش نەخوات تا دوای بانگ، چونکە مەرجی دروستی ڕۆژوو ئەوەیە کە لەو کاتەی نییەت دەهینێت تا بانگی ئێوارە نییەتی ڕۆژووەکەی بەردەوام بێت، ئەم کەسەیش پێش بانگی ئێوارە نیەتەکەی پچڕاوە بۆیە

ڕۆژووەکەی دروست نییە و بەتاڵە. هەر بۆیە ئەگەر کەسێك بانگی ئێوارەی دا هیچ نەبوو بەربانگی پێ بکات، با بە نیەت ڕۆژوەکەی بشکێنێت، ئەوندە بەسە و ڕۆژووەکەی پێ دەشکێت.

- کەسێك نوێژ دەکات لە ناوەڕاستی نوێژەکەیدا نیەت دەهێنێت نوێژەکەی ببڕێت، بەو نییەتە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و پێویستە بیبڕێت و سەر لەنوێ نوێژەکەی بکاتەوە؛ چونکە وەکە گوتمان نیەتی نوێژەکە پێویستە هەر لەسەرەتای کارەکەوە تا کۆتایی بەردەوام بێت و پچڕانی تێدا نەبێت.

٧- نیەتەکەی هاوتا بێت لەگەڵ ئەو مەبەستەی کە لە شەرعدا بۆی دانراوە، خۆ ئەگەر نیەتەکە هاوتا نەبوو یان پێچەوانە بوو لەگەڵ مەبەستی شەرع ئەو کات شەرعیش بە پێچەوانەی مەبەستی کەسەکەوە مامەڵە دەکات. بۆنموونە: کەسێك کەسێکی خۆی بکوژێت بەمەبەستی ئەوەی زوو میراتییەکەی وەربگرێت؛ شەرع بە پێچەوانەی مەبەستەکەی ئەوەوە مامەڵە دەکات و هەر بێبەشی دەکات لە میرات. و کار بەو ڕێسایە دەکات کە دەڵێت: (من استعجل شيئا قبل أوانه عوقب بحرمانه). واتە: هەر کەسێك پەلە بکات لەبەدەست هێنانی شتێك بەر لە وادەی سروشتی خۆی بە بێ بەش کردنی لەو مافە سزا دەدرێت.

ئەم خاڵانەی باسمان کردن مەرجی کارپێکردنی ڕێسای (الأمور بمقاصدها) ن و و هیچ نییەتێك بێ یەکێك لەو مەرجانە کاری پێ ناکرێت و بۆ خاوەنەکەی ئەژمار ناکرێت.

## ڕێسای دوو

## نية المؤمن خير من عمله

**واتە:** نیەتی کەسی بڕوادار بۆ کردنی کارێکی خێر، لە کردنی خودی کارەکە باشترە.

**هۆکار:** لەوانەیە ئەم ڕێسایە کەمێك سەیر بێت و پرسیاری ئەوە لای هەر یەکێکمان دروست بکات کە چۆن نیەتێکی سادە و ئاسان کە هیچی تێ ناچێت لە کردنی خودی کارەکە باشترە کە هەموو قورسی و ناڕەحەتییەکان دەکەونە کردنی کارەکەوە نەك نیەتەکەوە؟!

وەڵامی ئەم پرسیارە لەم چەند خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

١- مرۆڤ لەسەر کردەوەی بێ نیەت هەرگیز پاداشت وەرناگرێت، بەڵام دەکرێت لەسەر نیەتی بێ کردەوە پاداشت وەربگرێت، ئەمەیش کاتێك دەبێت کە کەسەکە هاوتا لەگەڵ نیەتەکەی ئامادەیی تەواوی ئەنجامدانی کارەکەی هەبێت، خۆ ئەگەر نیەتی کردنی کارەکەی هێنا و ئامادەباشی تەواوی تێدابوو بۆ کردنی، دواتر لەبەر هەر هۆکار یان ڕێگرێك لەدەرەوەی دەسەڵاتی خۆی نەیتوانی کارەکە بکات، ئەو کات خوای گەورە تەنها لەسەر نیەتەکەی پاداشتی تەواوی کارەکەی بۆ دەنوسێت. بۆ نموونە: کەسێك نیەتی هێناوە حەج بکات، چەند جارێك هەوڵ دەدات و ناو دەنوسێت، بەڵام ڕێگری دێتە پێش و بۆی ئەنجام نادرێت، ئەم پیاوە وەك ئەوە وایە حەجی کردبێت و ئەگەر بمرێت بەقەرزاری نامرێت و پاداشتی حەجەکەی وەردەگرێت.

بەڵام ئەگەر کەسەکە نیەتەکەی تەنها حەز و ئارەزوو یان خۆزگە بێت و هیچ ئامادەکارییەکەی بۆ نەکردبێت؛ ئەو کات هیچ پاداشت وەرناگرێت و ئەو ڕێسایەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت کە دەڵێت: (مجرد النية لا عبرة به في أحكام الشرع). واتە: بەتەنها نیەت هیچ نرخی نییە و کاری پێ ناکرێت لە حوکمە شەرعییەکاندا.

٢- نیەت پەنهانە و کاری دڵە و تەنها لە نێوان مرۆڤ و خوای گەورەدایە و کەمتر ڕوپامایی و دونیاویستی تێ دەکەوێت بەڵام زۆر کات ئەو نیەتانە لەکاتی جێبەجێ کردندا ڕوپامایی و دونیا ویستی و مەبەستی تری تێکەڵ دەبێت، کە لە پاداشتی کارەکە کەم

دەكەنەوە و یانیش هەندێك جار لەبنەڕەتەوە بەتاڵی دەكەنەوە. بۆ نموونە: نوێژی بەكۆمەڵ چەند خێری زۆرە، كاتێك دەبینیت خەڵكانێكی زۆر لە ڕیزی نوێژدا وەستاون، ئەوان هەموویان ڕوكەشیان یەكە و بەرامبەر یەك قیبلە وەستاون و یەك گوفتار و یەك ڕەفتار دووبارە دەكەنەوە؛ بەڵام ئایا هەموو ئەو كەسانەی لە ڕیزەكادان وەك یەك پاداشت وەردەگرن؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر، هەر یەكەیان بەئەندازەی ساغی نیەتەكان و ئاگایی دڵ و ملكەچی ڕۆحیان لە نوێژەكانیان پاداشت وەردەگرن. هەموو پەرستشەكانی تریش هەر وان و نیەتی كەسەكان ڕۆڵی سەرەكی دەبینێت لە وەرگرتن یان ڕەتكردنەوەیان و لە دیاری كردنی ڕێژەی پاداشتەكانیان.

٣- نیەت بەهۆی كەمی كاتەكەیەوە كەم تەرخەمی و كەم و كورتی تێ ناكەوێت، بەڵام زۆر جار كردەوەكان بەهۆی درێژی ماوەكەیانەوە لە كاتی جێبەجێ كردندا كەم و كورتی زۆریان تێ دەكەوێت و ئەمەیش لە پاداشتەكەیان كەم دەكاتەوە، بۆ نموونە كەسێك بەنیەتێكی پاك دەیەوێت نوێژ بكات دواتر لەكاتی نوێژەكەدا خەیاڵی دەڕوات و وەك پێویست ئاگای لێ نامێنێت. یان بەنیەتێكی پاك دەڕوات بۆ حەج یان دەیەوێت بەڕۆژو بێت دواتر لەكاتی حەجەكەی یان ڕۆژوەكەی توشی غەیبەت یان درۆ یان تورەبوون و ئازاردانی دڵی خەڵكی دەبێت و هەموو ئەمانەیش لە پاداشتی كردەوەكانی كەم دەكەنەوە و نیەتەكەی لە كردەوەكەی باشتر بووە.

٤- مرۆڤ زۆر جار دەیەوێت بەنیەتێكی پاكەوە كارێك ئەنجام بدات، بەڵام لە ڕووی نەزانینەوە بەهەڵە ئەنجامی دەدات، خوای گەورە لەسەر ساغی و پاكی نیەتەكەی دڵی پاداشتی دەداتەوە نەك هەڵەی كردەوەكەی، پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێت: {قَالَ رَجُلٌ لَأَتَصَدَّقَنَّ اللَّيْلَةَ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ، قَالَ: اللهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ، لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ غَنِيٍّ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ، قَالَ: اللهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ عَلَى غَنِيٍّ، لَأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ: تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللهُمَّ، لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ، وَعَلَى غَنِيٍّ، وَعَلَى سَارِقٍ، فَأُتِيَ فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ فَقَدْ قُبِلَتْ، أَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا تَسْتَعِفُّ بِهَا عَنْ زِنَاهَا، وَلَعَلَّ الْغَنِيَّ يَعْتَبِرُ فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللهُ، وَلَعَلَّ

السَّارِقَ يَسْتَعِفُّ بِهَا عَنْ سَرِقَتِهِ}.(رواه مسلم). واتە: پیاوێك گوتی: ئەمشەو لەپێناوی خوادا بڕێك پارە دەبەخشم، كە چووە دەرەوە پارەكەی دا بە ئافرەتێك كە نەیدەزانی داوێن پیسە، بەیانی قسەكە بە ناو خەڵكدا بڵاو بویەوە و گوتیان ئەمشەو فلاًن كەس خێری بە ئافرەتێكی داوێن پیس كردوە! پیاوەكە قسەكەی بیستەوە و گوتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ من نەمزانیوە داومە بە داوێن پیسێك، شەوی دواتر دیسان گوتی: ئەمشەو لەپێناوی خوادا بڕێك پارە دەبەخشم، كە چووە دەرەوە پارەكەی دا بە پیاوێك كە نەیزانی دەوڵەمەندە، بەیانی قسەكە بە ناو خەڵكدا بڵاو بویەوە و گوتیان ئەمشەو فلاًن كەس خێری بە دەوڵەمەندێك كردوە! پیاوەكە قسەكەی بیستەوە و گوتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ من نەمزانیوە داومە بە دەوڵەمەندێك. شەوی دواتر دیسان گوتی: ئەمشەو لەپێناوی خوادا بڕێك پارە دەبەخشم، كە چووە دەرەوە پارەكەی دا بە پیاوێك كە نەیزانی دزە. بەیانی قسەكە بە ناو خەڵكدا بڵاو بویەوە و گوتیان ئەمشەو فلاًن كەس خێری بە دزێك كردوە! پیاوەكە قسەكەی بیستەوە و گوتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ من نەمزانیوە خێرم بە داوێن پیس و دەوڵەمەند و دزێك كردوە. شەو هاتنە خەوی و دڵیان دایەوە و پێیان گوت: خوای گەورە هەموو خێرەكانی لێ قبوڵ كردویت، ئافرەتە داوێن پیسەكە لەوانەیە بە هۆی ئەو خێرەی تۆوە واز لە داوێن پیسی بهێنێت، دەوڵەمەندەكەیش لەوانەیە بەهۆی ئەو خێرەی تۆوە بیر بكاتەوە و پەند وەربگرێت و ئەویش لەمەو پاش ببەخشێت، و دزەكەیش لەوانەیە بەهۆی ئەو خێرەی تۆوە دەست لە دزی هەڵبگرێت.

كەواتە خۆشەویستان ئەم پیاوە هەرچەندە كارەكەی وەكو پێویست نەبووە؛ بەڵام خوای گەورە لەسەر پاكی نییەتەكەی هەموو كردەوەكانی لێ وەرگرتوە و پاداشتیشی داوەتەوە. ئەم مژدەیەیش تەنها بۆ ئەو پیاوە نییە بەڵكو بۆ هەموو كەسێكە كە لە ڕووی نەزانینەوە كاری لەو شێوەیە بكات.

٥- مرۆڤی بڕوادار نیەتی چاكەی زۆری هەیە بەڵام بەكەمیدا ڕادەگات، خوای گەورە هێندەی زۆری نیەتەكەی پاداشتی دەداتەوە نەك كەمی كردەوەكەی، بۆ نموونە: كەسێك نیەتی هەیە پارەی هەبێت عەمرە بكات زەكات بدات مزگەوت دروست بكات، هاوكاری خەڵكی هەژار و لێ قەوماو بكات بەڵام بەهەژاری دەمرێت و بە هیچ كام لەوانە ڕاناگات،

خوای گەورە لەسەر نیەتەكەی پاداشتی هەموو ئەوانەی بۆ دەنووسێت ئەگەر چی هیچیشیانی نەكردوە. پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەكدا دەفەرمویێت: {إِنَّمَا الدُّنْيَا لِأَرْبَعَةِ نَفَرٍ: عَبْدٍ رَزَقَهُ اللَّهُ مَالًا وَعِلْمًا فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقًّا، فَهَذَا بِأَفْضَلِ الْمَنَازِلِ، وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللَّهُ عِلْمًا، وَلَمْ يَرْزُقْهُ مَالًا فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ، يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالًا لَعَمِلْتُ بِعَمَلِ فُلَانٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ، فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ، وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللَّهُ مَالًا، وَلَمْ يَرْزُقْهُ عِلْمًا فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ، لَا يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَلَا يَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَلَا يَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقًّا فَهَذَا بِأَخْبَثِ الْمَنَازِلِ، وَعَبْدٍ لَمْ يَرْزُقْهُ اللَّهُ مَالًا وَلَا عِلْمًا فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالًا لَعَمِلْتُ فِيهِ بِعَمَلِ فُلَانٍ، فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ}. (رواه الترمذي وصححه الألباني). واتە: دونیا تەنها بۆ چواركەسە: یەكەم: كەسێك خوا ماڵ وزانستی پێداوە ئەویش هەست بەمنەتی خوای گەورە دەكات و لەترسی ئەو و لەپێناو ڕەزامەندی ئەودا كاری پێ دەكات وخزم وكەس وكاری پێ بەسەر دەكاتەوە، ئەو كەسە باشترین پلەی هەیە لای خوای گەورە. دووەم: كەسێك خوای گەورە زانستی پێداوە و ماڵی پێنەداوە، ئەویش بەنیەتێكی پاكەوە وپڕ بەدڵی ئاوات دەخوازێت و دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە ماڵ و سەروەتی پێ ببەخشیمایە وەك فلاّن كەس لەپێناوی خوای گەورەدا دەمبەخشی، ئەو دووانە وەك یەك پاداشتیان هەیە وخوای گەورە نیەتەكەی بەكردەوە بۆ ئەژمار دەكات. سێیەم: كەسێك خوای گەورە ماڵ وسەروەتی پێ داوە بەلاّم زانستی پێ نەداوە، ئەویش هیچ منەت لەخوای گەورە نازانێت بەڕاست و چەپدا لەبێ فەرمانی خوای گەورە و لەتاواندا خەرجی دەكات، نەخزمێكی پێ بەسەر دەكاتەوە و نەمافی خوای گەورەیشی لێ دەدات، ئەوە خراپترین جێگەی هەیە لای خوای گەورە. چوارەم: كەسێك خوای گەورە نەماڵ و پارە و نەزانیاریشی پێنەداوە ولەدڵی خۆی و بەنیەتێكی تەواوەوە دەڵێت: ئەگەر پارە و ماڵم دەبوو وەك فلاّن كەس بەڕاست و چەپدا بێ دڵی خۆم لێنەدەكرد، ئەو دووكەسەیش وەك یەك تاوانبارن.

٦- خوای گەورە كە بە هەتاهەتایی بڕواداران لە بەهەشتدا دەهێڵێتەوە و هەرچی ئارەزوو بكەن پێیان دەدات لەپاداشتی تەمەنی كورت و كردەوەی كەمیاندا نییە؛ بەڵكو لە پاداشتی نیەتی باش و باوەڕی دامەزراویاندایە كە ئەمانە نیەتیان وابووە ئەگەر بۆ هەتا هەتایەش لە دونیا بمێننەوە لەسەر كاری چاكە و خواناسی خۆیان هەر بەردەوام دەبوون

خوای گەورەیش بەپێی ئەو نیەتە مامەڵەیان لەگەڵ دەكات، بۆ مرۆڤی بێ باوەڕیش كاتێك بە هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە و هەرچی جۆری سزا هەیە دەیچێژێ هەر بەهەمان شێوەیە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: {مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ}. (رواه مسلم). واتە: هەر كەسێك ڕاستگۆیانە و لە ناخی دڵەوە داوا بكات خوای گەورە پلەی شەهیدی پێ ببەخشێت، خوای گەورە ئەو پلەو پاداشتەی پێ دەبەخشێت، ئەگەر لەسەر جێگەی نوستنەكەیشی بمرێت.

٢- وە دەفەرمویێت: {إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَامًا، مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا، وَلاَ قَطَعْتُمْ وَادِيًا إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ}، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟ قَالَ: {وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ، حَبَسَهُمُ العُذْرُ}.(رواه البخاري و مسلم). واتە: لە مەدینە خەڵكانێك هەن ئێوە بە هەر شوێنێكدا ڕۆشتبن و هەر شیو و دۆڵێكتان بڕی بێت ئەوانیش وەك ئێوە لە پاداشتەكەیدا هاوبەش بوون. هاوەڵەكان پێیان سەیر بوو گوتیان: ئەگەر ئەوان لە مەدینەش بن و لەماڵەكانیان نەهاتبنە دەرەوە؟!. فەرمووی: بەڵێ لەبەر ئەوەی ئەوانە پڕ بە دڵ حەزیان كردوە و نیەتیان هەبووە لەگەڵمان بێن؛ بەڵام پاساویان هەبووە كە لەگەڵمان نەهاتوون.

٣- وە دەفەرمویێت: {مَنْ أَتَى فِرَاشَهُ، وَهُوَ يَنْوِي أَنْ يَقُومَ فَيُصَلِّيَ مِنَ اللَّيْلِ، فَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ حَتَّى يُصْبِحَ، كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى، وَكَانَ نَوْمُهُ صَدَقَةً عَلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ}. (رواه إبن ماجة وابن خزيمة وصححه الألباني). واتە: هەر كەس چووە سەر جێگەكەی و نیەتی وابوو شەو هەستێتەوە شەو نوێژ بكات و پاشان خەوی لێ كەوت و تا بەیانی خەبەری نەبوویەوە، خوای گەورە خێری شەونوێژەكەی بۆ دەنوسێت و خەوەكەیشی بە خێرێك ئەژمار دەكرێت كە خوای گەورە پێی بەخشیوە.

جا بەڕێزان ئەگەر سەرنجی هەر سێ دەقەكە بدەین دەبینین هیچ كام لەو كەسانەی باس كراون لەدەقەكاندا نیەتەكانیان نەچۆتە بواری جێبەجێ كردنەوە؛ سەرەڕای ئەوەیش

خوای گەورە پاداشتی تەواوی کردەوەکانی پێ داون وەك ئەوەی کردبێتیان؛ ئەویش تەنها بەخاتری ئەوەی کە نیەتەکانیان لەگەڵ خوای گەورە ڕاست و دروست بووە.

ئەمەیش لە میهرەبانی خوای گەورە خۆیەوەیەتی و بەمەبستی هەڵنانی زیاتری بەندەکانێتی بۆ کاری چاکە، بۆیە هەر کەسێك نیەتی کردنی کارێکی چاکە بهێنێت خوای گەورە چاکەی کارەکەی بۆ دەنوسێت.

**هەڵاوێردەکانی ڕێساکە (استثناءات القاعدة):**

هەرچەندە ئەوەی باسمان کرد ڕێسایەکی گشتگیر و جێگیرە؛ بەڵام هەندێك بابەت ناگرێتەوە لەوانە:

١- نیەت و کردەوەکانی مرۆڤی دووڕوو: چونکە مرۆڤی دووڕوو کردەوەکانی لە نیەتی دڵی باشترن، کردەوەکانی لە ڕووکەشدا زۆر باش و چاکن؛ بەڵام خراپی نیەتەکەی کردەوەکانیشی تێك دەدات و لەبەین دەبات.

٢- نیەت بەتەنها ناگرێتەوە ئەگەر هاوپێچی گوفتار یان ڕەفتار نەکرێت، بۆ نموونە کەسێك نیەتی نوێژ بهێنێت و هیچ ڕێگرییەك نەبێت لەوەی نوێژەکەی بکات، بەتەنها نیەتەکەی پەرستشەکەی لە کۆڵ ناخات، یان کەسێك نیەتی تەڵاقدانی خێزانی هەبێت، تەڵاقی ناکەوێت تا لەواقیعدا بە گوفتار یان بەڕەفتار تەڵاقی نەدات.

٣- حەرام و قەدەغە کراوەکان ناگرێتەوە؛ چونکە ئەوانە تەنها پێویستیان بە نیەتە و هیچی تر، بۆ نموونە: کەسێك دزی ناکات، یان سوو ناخوات، یان درۆ ناکات، یان زینا ناکات، تەنها نیەتی ئەوە بێنێت کە لەبەر خوای گەورە ئەو کارانە ناکات بە پەرستش بۆی ئەژمار دەکرێت بەبێ ئەوەی پێویست بە هیچ گوفتار یان ڕەفتارێك بکات.

بۆیە لە هیچ کام لەم حاڵەتانەدا ناڵێین: نیەتی کەسی بڕوادار لە کردنی خودی کارەکە باشترە.

## ڕێسای سێ

## مقاصد اللفظ على نية اللافظ

واتە: مەبەستی قسە بەپێی نیەتی خاوەنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

گرنگی: ئەم ڕێسایە زیاتر پەیوەندی بەمامەڵەی نێوان مرۆڤەکانەوە هەیە لەگەڵ یەکتر، نەك مامەڵەکانیان لەگەڵ خوای گەورە؛ چونکە خوای گەورە مامەڵە لەگەڵ مەبەست و نیەتەکانی دڵیان دەکات نەك شتێکی تر،

ڕێساکە پێمان دەڵێت لە پێناو زانین و یەکلاکردنەوەی واتەی قسەکان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ مەبەست و نییەتی خاوەن قسەکان خۆیان نەك شتێکی تر، ئەم ڕێسایەش تەنها لەو کاتانەدا کاری پێ دەکرێت کە واتەی قسەکە ڕوون نەبێت، یاخود چەند واتەیەك هەڵبگرێت، بەڵام ئەگەر واتەی قسەکە ڕوون و ئاشکرا بوو ئەو کات گوێ لە مەبەستی خاوەنەکەی ناگیرێت و ڕاستەوخۆ کار بەقسەکەی دەکرێت ئەمیش بە پێی ڕێسای: (الصريح لا يحتاج إلى النية والكناية لا تلزم إلا بالنية). واتە: هەر قسەیەك واتەکەی ڕوون بوو پێویست بە زانینی نیەتی خاوەنەکەی ناکات و ڕاستەوخۆ کار بە قسەکەی دەکرێت، هەر قسەیەکیش واتەکەی ڕوون نەبوو بەبێ گەڕانەوە بۆ نیەتی خاوەنەکەی کاری پێ ناکرێت.

بۆ دڵنیابوونیش لە ڕوونی و نا ڕوونی قسە و زاراوەکانیش دەگەڕێینەوە سەر سەرچاوەی زاراوەکە، ئەگەر زاراوەکە شەرعی بوو ئەوە بە پێی شەرع لێکدانەوەی بۆ دەکرێت، وەك زاراوەکانی: (نوێژ، ڕۆژو، زەکات، حەج، تەڵاق، زینا). ئەگەریش یاسایی بوو ئەوە بەپێی یاسا لێکدانەوەی بۆ دەکرێت وەك زاراوەکانی: (سجن، حبس، جنحة، جناية، توقيف، إعدام). ئەگەریش هەڵقوڵاوی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی بوو، ئەوە بەپێی ئەو داب و نەریتانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

نموونە:

١- کەسێك واتەی تەڵاق بزانێت و بە خێزانەکەی بڵێت تەڵاقت کەوتبێت یەکسەر تەڵاقی دەکەوێت؛ چونکە وشەی تەڵاق واتەکەی ئاشکرایە و پێویست بە نیەت ناکات؛ بەڵام ئەگەر پێی گوت: تۆ هیجی من نیت، یان بڕۆرەوەماڵی باوکت، یان پەیوەندی من و تۆ

تەواو، بۆ یەکلاکردنەوەی واتەی هەر یەکێك لەم قسانە دەبێت بگەڕێینەوە سەر مەبەستی خاوەنەکەی خۆی؛ چونکە قسەکان ئەگەری ئەوەیان هەیە بەمەبەستی تەڵاق گوترابن، ئەگەریش هەیە تەنها بەمەبەستی سەرکۆنە کردن و عاجز کردن گوترا بن، بۆ یەکلا کردنەوەی ئەو دوو ئەگەرە دەگەڕێینەوە سەر مەبەستی خاوەنەکەی خۆی.

٢- کەسێك بە خێزانەکەی بڵێت: تەڵاقێکت کەوتبێت: تەڵاقێکی دەکەوێت دواتر ئەگەر گوتی: مەبەستم دوو تەڵاق یان سێ تەڵاق بووە، گوێی لێ ناگیرێت؛ چونکە قسەکەی ڕوونە کە باسی یەك تەڵاق دەکات.

٣- کەسێك بە خێزانەکەی بڵێت: (إن شاء الله) ئەگەر خوا ویستی تەڵاقت کەوتبێت، ئەگەر مەبەستی لە ویستی خوای گەورە پیرۆز کردن و هیوای وەرگرتن بێت لە لای خوای گەورە ئەوە تەڵاقی کەوتوە، ئەگەریش مەبەستی دوو دڵی و هەڵپەساردنی تەڵاقەکە بێت لەسەر ویستی خوای گەورە ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێت؛ چونکە کەس ویستی خوای گەورە نازانێت لەو ڕووەوە.

٤- کەسێك سێ جار لەسەر یەك بە خێزانەکەی بڵێت: تەڵاقت کەوتبێت، تەڵاقت کەوتبێت، تەڵاقت کەوتبێت. ئەگەر گوتی مەبەستم یەك تەڵاق بووە و بەمەبەستی جەخت کردنەوە لەسەر خستنی دووبارە و سێ بارەم کردۆتەوە، ئەو کات یەك تەڵاقی دەکەوێت، بەڵام ئەگەر گوتی: مەبەستم بووە سێ جار تەڵاقی بدەم، ئەوە هەر سێ تەڵاقەکەی دەکەوێت.

٥- کەسێك بە خێزانەکەی بڵێت: وەکو دایکم وایت، یان لە جێی دایکم بیت، ئەم قسەیە ئەگەر هەیە مەبەستی خاوەنەکی حەرامکردنی خێزانی بێت لەسەری وەکو دایکی، ئەگەریش هەیە مەبەست لێی تەڵاق دانی بێت، ئەگەریش هەیە مەبەست لێی لێك چواندن بێت لە ڕێز و حورمەتدا. ئەگەریش هەیە مەبەست لێی لێك چواندن بێت لە قەد و باڵا و لەش و لاردا، بۆ یەکلاکردنەوەی هەموو ئەم ئەگەرانە دەگەڕێینەوە سەر نیەتی خاوەنی قسەکە خۆی.

٦- کەسێك پەرستشێکی ئەنجامدا وك نوێژ و ڕۆژو و حەج و هەر پەرستشێکی تر پاشان لێمان پرسی

كە ئەو پەرستشەت ئەنجام داوە و لەوەڵامدا گوتی: (إن شاء الله). ئەگەر مەبەستی قسەكەی دوو دڵی بێت لە ئەنجامدانی، ئەوە پەرستشەكەی دروست نییە و دەبێت بیكاتەوە، ئەگەریش مەبەست لێی پیرۆز كردن و هیوای وەرگرتن بێت لە لای خوای گەورە ئەوە دروستە و هیچ كێشەی نییە، تەنها نیەتی كەسەكە خۆی ئەم دوو ئەگەرە یەكلا دەكاتەوە.

٧- كەسێك بەكەسێكی گوت (زیناكار) یان (داوێن پیس) دەبێت قسەكەی بسەلمێنێت لە ڕێی چوار شایەتەوە، یانیش دەبێت سەد شەلاقی لێ بدرێت؛ چونكە تۆمەتبار كردن بەزینا زاراوەیەكی ڕوونە و سزاكەیشی دیاری كراوە. بەڵام ئەگەر تۆمەتی ناپاكی دایە پاڵ، ئەو كات ناپاكی زۆر شت دەگرێتەوە و بۆ یەكلاكردنەوەی واتەكەی دەبێت بگەڕێینەوە سەر مەبەستی كەسەكە خۆی كە قسەكەی كردوە.

٨- كەسێك نەزری كردوە نوێژ بكات یان ئاژەڵێك یان بڕێك پارە بكات بە خێر، نیەتی كەسەكە خۆی ژمارە و جۆر و بڕ و قەبارەی هەر یەك لەم نەزرانە یەكلا دەكاتەوە.

٩- خواردنێك بۆ كەسێك دادەنێن كە بیخوات، ئەویش گومانی لە حەرامی خواردنەكە هەیە و سوێند دەخوات كە نەیخوات، دواتر بۆی ڕوون دەبێتەوە كە خواردنەكە حەرام نییە، ئێستا ئەگەر بیخوات ئاساییە و سوێندەكەی ناكەوێت؛ چونكە سوێندەكەی ئەو لەسەر حەرامی بووە، ئێستا كە دەركەوتووە حەڵاڵە هیچ كێشەی نییە.

١٠- كەسێك تاوانێك دەكات لە ڕووی یاساییەوە ئەگەر گوتمان تاوانەكە (جناية) یان (جنحة) یە ئەوە هەر یەكە و قەبارە و واتە و سزای خۆی هەیە، ئەگەریش گوتمان سزاكەی (سجن) یان (حبس) ە، هەر یەك لەوانەیش واتە و ماوە و ڕێكاری خۆی هەیە و بەپێی دەقە یاساییەكان مامەڵە لەگەڵ ئەو زاراوانەدا دەكرێت.

١١- كەسێك لە پێشانگەیەكی ئۆتۆمبێل یان لە بازاڕی دۆلارەكە كاتێك مامەڵە بە دەفتەر دەكات هەموومان دەزانین مەبەست لێی پەڕاوی نووسین نییە؛ بەڵكو هەر دەفتەرێك (١٠٠٠٠$) ە، و لە بوونی هەر كێشەیەكدا وەك ئەو بڕە پارەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت، نەك وەك شتێكی تر. یان كاتێك دەڵێین ئۆتۆمبێلێكی (مەرزیە، بێریڤان، وەنەوشە) هەموو ئەمانە بەپێی عورفی بازاڕی ئۆتۆمبێل وەك جۆری ئۆتۆمبێل مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێت نەك وەك ناوی خەڵك.

بۆیە بۆ لێكدانەوەی هەر زاراوەیەك دەبێت بگەڕێینەوە سەر سەرچاوەی زاراوەكە و لەوێوە لێكدانەوە بۆ واتەكەی بكەین.

**هەڵاوێردەكانی ڕێساكە (استثناءات القاعدة):**

ئەم ڕێسایە لە كاتی ناكۆكی و سكاڵا و یەكلا كردنەوەی كێشەدا كاری پێ ناكرێت؛ چونكە لەو كاتانەدا هەر سوێند و بەڵێنێك هەبێت لەسەر مەبەستی كەسی بەرامبەر دەبێت نەك خاوەنی قسە و سوێندەكە. پێغەمبەری خودا لەو بارەیەوە دەفەرموێت: {يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ بِهِ صَاحِبُكَ}. (رواه مسلم). واتە: سوێندەكەت لەسەر ئەو بابەتەیە كە بەرامبەرەكەت باوەڕت پێدەكات.وە لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت: {الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ}. (رواه مسلم). واتە: سوێند خواردن لەسەر نیەتی ئەو كەسەیە كە سوێندت دەدات، نەوەك ئەو كەسەی كە سوێند دەخوات.

ئەمەش خاڵێكی گرنگە و پێویستە لێی بەئاگا بین؛ چونكە بەم پێیە بێت زۆرێك لەو سوێندانەی خەڵكی لە كاتی یەكلاكردنەوەی كێشەكاندا دەیخۆن كە بە حسابی خۆیان بە پێچ و پەنا دەیخۆن و لە دڵی خۆیاندا لەسەر شتێكی تر سوێند دەخۆن كە پەیوەندی بە باتەكەوە نییە، هەموو ئەمانە دەچنە خانەی سوێندی درۆوە و كەسەكان لەسەری گوناهبار دەبن و كەفارەتیان دەكەوێتە سەر.

بۆ نموونە: كاتێك دادگا كەسێك سوێند دەدات لەسەر ئەوەی كە پارەی كەسی بەرامبەری نەخواردووە، نابێت ئەم بەو مەبەستە سوێند بخوات كە كاغەز و ئاسن و كانزاكەی نەخواردووە، خۆ ئەگەر بەو مەبەستە سوێندی خوارد سوێندەكەی كەوتوە؛ چونكە ئەو دەبێت سوێندەكەی لەسەر نیەتی دادوەر و كەسی بەرامبەر بێت كە پارەی ئەوی زەوت نەكردوە و هیچ مافێكی دارایی لای نییە نەك مەبەستی دڵی خۆی.

پێشەوا نەوەوی دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: (وهذا الحديث محمول على الحلف باستحلاف القاضي، فإذا ادعى رجل على رجل حقا، فحلفه القاضي فحلف وورّى، فنوى غير ما نوى القاضي، انعقدت يمينه على ما نواه القاضي ولا تنفعه التورية، وهذا مجمع عليه، ودليله هذا الحديث والإجماع). (شرح صحيح مسلم للنووي:١١/١١٧). واتە: ئەم فەرموودەیە لەسەر سوێندێكە كە لە دادگا و لەسەر داوای دادوەر دەدرێت، بۆیە ئەگەر پیاوێك داوای مافێكی

لەسەر كەسێكی دیكە هەبوو و دادوەر سوێندی كەسی سكاڵا لەسەر كراوی دا و ئەویش بە پێچ و پەنا سوێندی خوارد و مەبەستی سوێندەكەی ئەوە نەبوو كە دادوەر سوێندی لەسەر دەدات، سوێندەكەی بەو پێیە مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت كە دادوەر سوێندی لەسەر داوە نەك نیەتی خۆی و ئەو پێچ و پەنایەی لە سوێندەكەیدا بەكاری هێناوە هیچ سودی نابێت، ئەمەیش كۆدەنگی زانایانی لەسەرە و بەڵگەیشیان ئەم فەرموودەیە و كۆدەنگی زانایانە.

جا خۆشەویستان هەرچەندە بابەتی نیەت زۆر فراوانە و ڕێساكانیشی زۆرن؛ بەڵام ئەوەی لەم سێ ڕێسایەدا باسمان كردوە و كۆمان كردۆتەوە زۆربەی زۆری بابەتەكانی لەخۆ گرتوە و كۆ كردۆتەوە.

## ڕێسای چوار

## اليقين لايزول بالشک

واتە: دڵنیایی بە ئەگەر و گومان لاناچێت.

گرنگی: ئەمە یەكێكی ترە لەو پێنج ڕێسا فیقهییەی كە كۆی حوكمە شەرعییەكانی لەسەر دامەزراوە و زانایان كۆكن لەسەر كارپێكردنیان. پێشەوا سیوطی دەربارەی ئەم ڕێسایە دەڵێت: (إعلم أن هذه القاعدة تدخل في جميع أبواب الفقه، والمسائل المخرجة عليها تبلغ ثلاثة أرباع الفقه وأكثر). (السيوطي، الأشباه والنظائر، ص٥١). واتە: بزانە ئەم ڕێسایە دەڕواتە ناو هەموو بابەتە فیقهییەكانەوە و ئەو بابەتانەی لێی هەڵێنجراون دەگەنە سێ لەسەر چواری حوكمە فیقهییەكان و زیاتریش. پێشەوا قەرافییش دەڵێت: (أن كل مشكوك فيه يجعل كالمعدوم التي يجزم بعدمه). (القرافي، الفروق، ج١، ص١١١). واتە: هەرشتێك جێی گومان بێت وەك نەبوو سەیری دەكرێت و مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

هاوشێوەی ئەم ڕێسایە ڕێسایەكەی ترمان هەیە دەڵێت: (ما ثبت بيقين لا يرتفع إلا بيقين). واتە: هەر كارێك دڵنیابووین لەبوونی كاری پێ دەكرێت تا ئەو كاتەی دڵنیا دەبینەوە لە نەمان و لاچوونی.

ئەم دوو ڕێسایە كارئاسانی زۆریان بۆ مرۆڤەكان كردوە، بە تایبەتی بۆ ئەو كەسانەی كە بەردەوام كێشەی وەسوەسە و دوودڵییان هەیە و لەهەموو كار و پەرستشەكانیان بەگومانن و زۆر جار شتی خراپ بەدڵ و مێشكیاندا دێت و ئەو گومانانەیش زۆر بێزاریان دەكات و زۆر جار لە خواناسی ساردیان دەكاتەوە.

ئێستا ئەم ڕێسایە دڵنیایی تەواویان پێ دەبەخشێت كە ئەو گومان و وسوەسانە هیچ كاریگەری خراپ لەسەر باوەڕ و پەرستشەكانیان دروست ناكات و هەر وەك نەبوو مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێت.

سەرچاوە: ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾. (سورة يونس: ٣٦).
واتە: گومان هیچ لە گەورەیی ڕاستی و دڵنیایی کەم ناکاتەوە و ناگۆڕێت.

٢- وە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ﴾. (سورة الحجرات: ١٢).
واتە: ئەی گرۆهی بڕواداران خۆتان لەگومان بپارێزن و کاری پێ مەکەن.

٣- عەبدوڵڵای کوڕی زەید دەگێڕێتەوە دەڵێت: جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەسی وامان هەیە لەکاتی نوێژدا سکی پێچی پیادێت و قوڕەی دێت و گومانی لەدەستنوێژەکەی بۆ دروست دەکات و وا هەست دەکات کە بای لێ بوبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {لاَ يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا}. (رواه البخاري ومسلم). واتە: با گوێی پێ نەدات و نوێژەکەی نەبڕێت تا بەڕوونی گوێی لەدەنگی بایەکەی نەبێت یان بۆنە ناخۆشەکەی نەیەت بەسەریدا.

٤- لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: {إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلاَثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ}. (رواه مسلم). واتە: ئەگەر کەسێکتان گومانی لە نوێژەکەی بۆ پەیدابوو نەیدەزانی چوار ڕکات نوێژی کردووە یان سێ ڕکات، با واز لەوە بێنێت کە گومانی لێی هەیە و کار لەسەر ئەوە بکات کە لێی دڵنیایە.

٥- وە دەفەرموێت: {صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ}. (رواه البخاري ومسلم). واتە: ئەگەر مانگی ڕەمەزانتان بینی بەڕۆژوبن، وە ئەگەر مانگی شەوالتان بینی ڕۆژو بشکێنن، خۆ ئەگەر مانگ نەبینرا و دڵنیا نەبوون لەوەی ڕەمەزانە یان نا ئەوە سی ڕۆژی شەعبان تەواوبکەن.

کۆی ئەم دەقانە فەرمانمان پێدەکات کە دوور بکەوینەوە لە دوودڵی و گومان و کاری پێ نەکەین، جا ئەو گومانە لە هەر بوار و کایەیەکی ژیاندا بێت جیاوازی نییە.

**نموونە:**

١- سەتڵێك ئاومان دانالە شوێنێکدا، گومانمان وابوو لەوانەیە شەو ئاژەڵێکی وەك سەگ دەمی تێ خستبێت و ئاوەکە پیس بووبێت، ئاوەکە هەر مامەڵەی پاکی لەگەڵ دەکرێت؛ جونکە سەرەتا دڵنیاین ئاوەکە پاك بووە و پیس بوونی گومانە، و دڵنیاییش بەگومان لاناچێت.

٢- کەسێك لە دەشتێکدا کاتژمێری پێ نییە و بەهۆی هەور و هەڵاوە خۆر دیار نییە و نازانێت کاتی نوێژی نیوەڕۆ هاتووە یان نا، ئەگەر بەو گومانەوە نوێژ بکات و دڵنیا نەبێت لە هاتنی کاتی نوێژەکە نوێژەکەی بەتاڵە - ئەگەرچی کاتیشی هاتبێت - و دەبێت کەی دڵنیا بوو لە هاتنی کاتەکەی بیکاتەوە؛ چونکە هیچ پەرستشێك لەسەر گومان دانامەزرێت.

٣- کەسێك دڵنیا نییە لەوەی کە سبەینێ مانگی ڕەمەزانە، ئەگەر بەڕۆژوو بێت نەك هەر ڕۆژووەکەی بەتاڵە بەڵکو گوناهباریش دەبێت؛ چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی کردوە کەسێك بەگومان بەڕۆژو بێت.

٤- کەسێك پارشێو دەکات بە گومانی ئەوەی دونیا هێشتا شەوە و بانگی بەیانی نەداوە، دواتر بۆی دەرکەوت بانگی بەیانی داوە ڕۆژوەکەی دروستە، چونکە بوونی شەو لەو کاتەدا یەقین بووە و هاتنی ڕۆژ گومان بووە و دڵنیاییش بە گومان لاناچێت.

٥- کەسێك بەڕۆژووە نازانێت بانگی شێوانی داوە یان نا، تا دڵنیا نەبێت لەوەی بانگی شێوانی داوە ڕۆژوەکەی بشکێنێت، ڕۆژوەکەی بەتاڵە، چونکە ئەو لەبوونی ڕۆژ دڵنیایە و هاتنی شەو گومانە و دڵنیاییش بەگومان لاناچێت.

٦- کەسێك شەو خەو دەبینێت و وا دێتە خەیاڵی تووشی لەشگرانی بووبێت، کە هەستا لەخەو ئەگەر تەڕایی بینی یان پاشماوەی ئاوی بەجلەکانییەوە بینی دەبێت خۆی بشوات؛ بەڵام ئەگەر هیچ کام لەوانەی نەبینی  پێویست ناکات خۆی بشوات؛ چونکە ئەم کەخەوتووە لەشی پاك بووە و حاڵەتی لەشگرانییەکەی لەخەودا گومانە و دڵنیاییش بەگومان لاناچێت.

٧- کەسێك زەکات دەدات بەکەسێك یان کۆمەڵێك یان دامەزراوەیەك بەگومانی ئەوەی زەکاتیان پێ دەشێت یان ئەوان بۆی دەدەن بەخەڵکانی شیاو، ئەگەر تەواو دڵنیا نەبێت لەوەی کە ئەوانە زەکاتیان پێ دەشێت یان دەدەیدەن بە خەڵکانی شیاو زەکاتی پارەکانی دەرناچێت؛ چونکە زەکات مافێکی جێگیری خەڵکانێکی دیاریکراوە و بە ئەگەر و گومان دەرناچێت.

٨- کچ و کوڕێك ئەیانەوێت هاوسەرگیری بکەن، گومان هەیە لەوەی شیریان پێکەوە خواردبێت، بەو گومانە لەیەکتر حەرام نابن تا بەڵگەی دڵنیاکەرەوەیان دەست نەکەوێت لەسەر ئەوەی کە پێکەوە شیریان خواردووە.

٩- کەسێکی بڕوادار گوفتارێك یان ڕەفتارێکی کردوە گومانی کوفری لێ دەکرێت، بەو گومانە کافر نابێت؛ چونکە دڵنیاین لەوەی ئەو لە بنەڕەتدا بڕوادارە و کافر بوونی جێی گومانە و دڵنیاییش بەگومان لا ناچێت.

١٠- کەسێك دەماغی مردووە، بەڵام دڵی هێشتا زیندووە و سییەکانی هەناسە دەدەن، ناتوانین بە مردوو لە قەڵەمی بدەین و میراتییەکەی دابەش بکەین و وەسییەتەکانی جێبەجێ کەین، یان ڕێگە بە خێزانەکەی بدەین ماوەی (عدة) ی دەست پێ بکات؛ چونکە دڵنیاین لەوەی کە ئەو پێشتر لە ژیاندا بووە و لە ئێستادا مردنی جێگای گومانە و دڵنیاییش بەگومان لاناچێت و پێویستە تەواو دڵنیا بین لە مردنی ئەو کات ئەو کارانە بکەین.

## ڕێسای پێنج

## الأصل في الأشياء الإباحة (الحل)

**واتە:** هەموو شتێك لەبنەڕەتدا ڕێگەپێدراوە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە هەڵقوڵاوی ڕێسای پێشوە و بەڵگەی سۆز و میهرەبانی خوای گەورەیە بەرامبەر بەندەکانی و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە لە ئاژەڵ و ڕووەك و کانزا خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و ئامێر و گوفتار و ڕەفتار و نەریت و مامەڵە و گرێبەست و بازرگانی و ... هتد هەمووی ڕێگە پێدراوە و خوای گەورە بۆ خزمەتکردن و خۆشگوزەرانی مرۆڤەکانی دروست کردووە و بۆی ڕام کردون تا سوودی لێ ببینن و بەکاری بهێنن، مەگەر شتێك نەبێت کە زیانیان پێ بگەیەنێت و دەقێکی شەرعی حەرام و یاساغی کردبێت، ئەویش هەر لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندی مرۆڤەکاندایە، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ﴾. (سورة الحج: ٦٥). واتە: ئایا نابینیت چۆن خوای گەورە هەرچی لە سەر زەوی هەیە بۆ ڕام و کردون. وەدەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا﴾. (سورة الجاثية:١٣). واتە: خوای گەورە هەرچی لە ئاسمانەکان و سەرزەویدا هەیە بۆی ڕام کردون.

هەر بۆیە و بەپێی ئەم ڕێسا و دەقانە ژمارە و ڕێژەی شتە حەرام و یاساغەکان زۆر کەمن و بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن و هەر شتێکیش کە حەرام کرابێت بەهۆی زیانەکانییەوە حەرام کراوە و لەبەرامبەریدا خوای گەورە دەیەها جێگرەوەی حەڵاڵی بێ زیانی داناوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر کەس بڵێت ئەو کارە یان خواردنە یان مامەڵەیە حەرامە دەبێت بەڵگەی حەرامی بەدەستەوە بێت، ئەگەر نا قسەکەی وەرناگیرێت، بەڵام بۆ کەسێك کە بڵێت حەڵاڵە بەڵگەی ناوێت؛ چونکە بەپێی ئەم ڕێسا و بەڵگانە هەموو شتێك ڕێگە پێدراوە و دروستە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- جگە لەو دوو ئایەتەی سەرەوە کە باسمان کرد، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمویێت: ﴿قُلْ لَا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾. (سورة الأنعام: ١٤٥). واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ من بەپێی ئەو پەیام و بەرنامەیەی بۆم هاتووە شتێك نابینم خواردنی لەسەرم حەرام کرابێت مەگەر گۆشتی ئاژەڵێکی مردارەوەبوو، یان خوێنێکی ڕژاو، یان گۆشتی بەراز کە هەر خۆی پیسە، یان ئاژەڵێك بۆ غەیری خوای گەورە سەربڕدابێت.

٢- وە دەفەرمویێت: ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾. (سورة الأنعام: ١١٩). واتە: ئەوە بۆچی لەگۆشتی ئەو ئاژەڵانە ناخۆن کە لە کاتی سەربڕیندا ناوی خوای گەورەی لەسەر هاتووە، لە کاتێکدا خوای گەورە هەموو شتە حەرامەکانی بۆ ڕوون کردونەتەوە. و جگە لەوانە هەموو ئەو شتانەی تر حەڵاڵن و دەتوانن سوودیان لێ وەربگرن.

٣- وە دەفەرمویێت: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾. (سورة الأعراف:٣٢). واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ ئەوە کێیە ئەو شتە جوان و باش و ڕزقە پاکانە لەسەر خەڵکی حەرام دەکات کە خوای گەورە بۆ سوود و بەختەوەری ئەوان دروستی کردوون.

٤- پێغەمبەری خوایش ﷺ دەفەرمویێت: {الْحَلَالُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ، فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ}. (سنن ابن ماجة و الترمذي وحسنه الألباني). واتە: حەڵاڵەکان ئەو شتانەن کە خوای گەورە بە حەڵاڵی داناوە و حەرامەکانیش ئەوانەن کە خوای گەورە بە حەرامی داناوە، هەر شتێکیش باسی لێوە نەکراوە ئەوانە حەڵاڵن و خوای گەورە چاوپۆشی لێکردووە.

٥- ئەمانە و دەیەها دەقی تر هەن هەموویان جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکەنەوە کە حەرامەکان لەشەرعدا کۆمەڵێك شتی کەم و سنووردار و شتی بێ کەڵك و زیانبەخشن و جگە لەوانیش هەرچی لەم گەردوونەدا هەیە حەڵاڵ و ڕێگە پێدراوە.

**نموونە:**

هەموو جۆرە هەڵسوكەوت و گوفتار و ڕەفتارێك، خواردن و خواردنەوەیەك، كڕین و فرۆشتن و مامەڵە و بازرگانییەك، داب و نەریت و كلتوری كۆمەڵگەیەك، زانست و تەكنەلۆجیا و داهێنانێك، هەموو جۆرە دەرمان و نەشتەرگەری و چارەسەرێك، و هەرچی تر هەیە لە گەردوون و بونەوەردا حەڵاڵە و ڕێگە پێدراوە، مەگەر ئەو شتانە نەبێت كە زیان بەخشن و دەقێكی شەرعی یاساغی كردوون.

**هەڵاوێردەكانی ئەم ڕێسایە:**

ئەم ڕێسایە چەند شتێك ناگرێتەوە، لەوانە:

١- پەرستشەكان: ڕێسای پەرستشەكان بە پێچەوانەی ئەم ڕێسایەوەیە كە باسمان كرد و لەبنەڕەتدا هیچ پەرستشێك دروست نییە تا بەڵگەیەكی شەرعی ڕێگەی پێ نەدات و پشتڕاستی نەكاتەوە؛ هەر بۆیە زانایان دەربارەی پەرستشەكان گوتویانە: **(الأصل في العبادات المنع)**. واتە: هیچ پەرستشێك ڕێگە پێدراو نییە مەگەر دەقێكی شەعی ڕێگەی پێ بدات و پشتڕاستی بكاتەوە؛ چونكە پەرستشەكان ڕێگەكانی گەیشتنن بەخوای گەورەن و تەنها خوای گەورە خۆی ئەو مافەی هەیە ڕێ و شوێن و شێواز و چەندێتی و چۆنییەتی و كات و مەرجەكانی ئەو بەیەك گەیشتنە دیاری بكات، هەر بۆیە هەر كەسێك هەر شتێك لە دیندا زیاد بكات بە بیدعە لەسەری ئەژمار دەكرێت وهەموو بیدعەیەكیش گومڕایی و سەرلێشێواوییە و ڕەت دەكرێتەوە و كاری پێ ناكرێت.

٢- پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو: پەیوەندی نێوان ژن و پیاویش لە بنەڕەتدا وەك پەرستشەكان وایە و ڕێگە پێدراو نییە تا لەسەر ڕێكار و بنەما شەرعییەكان نەبێت، بۆ نموونە: پیاوێك بۆی نییە سەیری ئافرەتێكی نامەحرەم بكات، یان دەستی بۆ بەرێت، یان بەتەنیا لە شوێنێكی داخراو لەگەڵی بمێنێتەوە، یان هاوڕێیەتی لەگەڵ بكات، هەموو ئەمانە لە بنەڕەتدا حەرام و یاساغن و بەپێچەوانەی ڕێسای (هەموو شتێك لەبنەڕەتدا ڕێگەپێدراوە) مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێت.

٣- گۆشت: یەكێكە لەو خواردنانەی كە لەشەرعدا خواردنی ڕێگە پێدراوە؛ بەڵام بەكۆمەڵێك مەرج كە دەبێت تەواو لێیان دڵنیا بین ئەوجا بۆمان هەیە بیخۆین، لەوانە:

- گۆشتەکە هی ئاژەڵێك بێت کە شەرع ڕێگە بە خواردنی بدات وەکو مەڕ و مانگا.
- دڵنیا بین لەوەی کە بەشێوازێکی شەرعی ئاژەڵەکە سەربڕدراوە.
- دڵنیا بین لەوەی کە کەسێکی موسوڵمان یان مەسیحی یان جولەکە سەری بڕیوە؛ چونکە جگە لەوانە سەربڕاوی دەستی هیچ کەسێکی تر دروست نییە و حەرامە.

ئەگەر تەواو دڵنیا بوین لەو مەرجانە ئەو کات دەتوانیت گۆشتەکە بخۆین، بەڵام ئەگەر لێیان یان لە یەکێکیان دوودڵ و بەگومان بوین، ئەو کات بۆمان نییە گۆشتەکە بخۆین، ئەمەش پێچەوانەی یاسای سەرجەم خواردەمەنییەکانی ترە بۆ نموونە: برنج و نیسك و نۆك و سەرجەم دانەوێڵەکان، یان سەوزەوات، یان میوەهات، یان بامیە و کولەکە، ئەمانە بەرهەمی دەستی هەرکەس بن و هەرچۆن بەرهەم هاتبن خواردنیان حەڵاڵە و پێویست بە بەدواداچوون ناکات و بەپێی ڕێسای (هەموو شتێك لەبنەڕەتدا ڕێگەپێدراوە) مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، بەڵام گۆشت بە پێچەوانەوەی ئەو ڕێسایەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و تا تەواو دڵنیا نەبین لە حەڵاڵی و لەو مەرجانەی لەسەرەوە باسمان کردن دروست نییە بخورێت.

## ڕێسای شەش

## الأصل بقاء ماكان على ماكان

**واتە:** سەرجەم ئەرك و مافە شەرعی و یاساییەكانی نێوان مرۆڤەكان و حوكمە شەرعییەكان جێگیرن و لەجێی خۆیانن.

ئەم ڕێسایەیش دیسان هەڵقوڵاوی ڕێسای **(اليقين لايزول بالشك)** ە، و جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە، كەهەموو شتێك لە ئێستادا بەپێی ڕابوردووەكەی مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت، تا بەڵگەیەك لەبەردەستدا نەبێت پشتڕاستی گۆڕینی بكاتەوە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە دامەزراوی و جێگیرییەكی زۆر دەداتە حوكمە شەرعییەكان و دڵنیایی تەواو سەبارەت بە پاراستنی مافەكان دەداتە مرۆڤەكان و كارئاسانییەكی زۆر بۆ ئەوان و یاسا و دادگاكانیش دەكات و بەشێكی زۆر لەئەرك و كێشەكانیان لەكۆڵ دەكاتەوە و بۆ یەكلا دەكاتەوە؛ چونكە حوكمەكان لە ڕابوردودا بەپێی بەڵگەیەك لە بەڵگەكان جێگیر بوون و دامەزراون، ئەم حوكمانە لە جێی خۆیان دەمێننەوە و كاریان پێ دەكرێت هەتا بەڵگەیەكی پێچەوانە دروست ئەبێت بەگۆڕینیان، بۆ نموونە: ژن و پیاوێك بەپێی گرێبەستێكی شەرعی هاوسەرگیری دەكەن، ئەم دوو كەسە تا بمێنن وەك دوو هاوسەر مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێت و هەموو ئەرك و مافە یاساییەكانی ژیانی هاوسەرییان پێ دەبڕێت و چیتر پێویست ناكات هەموو ڕۆژێك گرێبەستی هاوسەرگیرییەكەیان تازە بكەنەوە و هیچ كامیان و هیچ كەسیش بۆی نییە بە پێچەوانەی لێكەوتەكانی ئەو گرێبەستەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، تا ئەو كاتەی بەبەڵگەیەكی شەرعی دەیسەلمێنن كە لێك جیا بوونەتەوە و پەیوەندییەكەیان كۆتایی هاتووە، ئەو كات حوكمی جیابوونەوەكە جێگیر دەبێت و بەردەوام دەبێت تا بەبەڵگەوە گۆڕانكارییەكی تر بەسەر پەیوەندییەكەیاندا دێت و ئەم حوكمەیش تەنها بۆ گرێبەستی هاوسەرگیری نییە، بەڵكو بۆ سەرجەم گرێبەست و مامەڵەكانی ژیانی مرۆڤەكانە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە زیاد لەو دەقانەی كە پێشتر بۆ ڕێسای: **(اليقين لايزول بالشك)** باسمان كردون، پشت بە كۆمەڵێك سەرچاوەی تر دەبەستێت لەوانە: خودی ڕێسای

(اليقين لا يزول بالشك)؛ چونكە ئەوەی پێشتر بە بەڵگە دامەزراوە و جێگیر بووە، وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت، تا بەڵگەی گۆڕینی دێت؛ لەبەر ئەوەی ئەوانە بوون بە (یقین) و هاتنی گۆڕانكاری گومانە و پێویستی بە پشتڕاستكردنەوە هەیە بۆیە كاری پێ ناكرێت، ئەمەیش كۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

نموونە:

١- هیچ پەرستشێك ڕێگەپێدراو نییە تا بەڵگەیەكی دروست لەبەردەستدا نەبێت پشتڕاستی بكاتەوە و ڕێگەی پێ بدات؛ چونكە (الأصل في العبادات المنع). هەر بۆیە كاتێك كەسێك پەرستشێك دەكات و كەسێك پێی دەڵێت دروست نییە، ئەو كەسەی پەرستشەكە دەكات یان دەڵێت هەیە دەبێت بەڵگە بۆ كارەكەی یان قسەكەی بهێنێتەوە نەك ئەو كەسەی كەدەڵێت دروست نییە.

٢- هیچ مامەڵەیەك یاساغ و حەرام نییە تا بەڵگەیەكی دروست لەبەردەستدا نەبێت حەرامی بكات؛ چونكە (الأصل في الأشياء الإباحة (الحل)..). هەربۆیە كاتێك كەسێك مامەڵەیەك یان گرێبەستێك دەكات و كەسێك پێی دەڵێت دروست نییە، ئەو كەسەی دەڵێت دروست نییە دەبێت بەڵگە بهێنێتەوە بۆ قسەكەی؛ نەك ئەو كەسەی مامەڵەكەی كردوە.

٣- ئافرەتێك لە دادگا سكاڵا لە سەر مێردەكەی تۆمار دەكات كە بژێوی ژیانی دابین ناكات، پیاوەكەش دەڵێت كردومە، پیاوەكە بۆ سەلماندنی قسەكانی پێویستە بەڵگە بهێنێتەوە؛ چونكە دابینكردنی بژێوی ئافرەتەكە لەسەر هاوسەرەكەی بەپێی گرێبەستی هاوسەرگیرییەكەیان مافێكی جێگیرە و لە ئەستۆی پیاوەكەیە و پێویست بەبەڵگە ناكات، بۆیە ئەوەی پێویستە بەڵگە بۆ قسەكانی بهێنێتەوە پیاوەكەیە نەك ژنەكە.

٤- ئافرەتێك تەڵاق درا و نەماندەزانی كەماوەی سوڕی مانگانەی (عيدة) تەواو بووە یان نا، پێویستە پرسیار لەخۆی بكەین: ئەگەر گوتی تەواو بووە یان نا قسەی خۆی وەردەگیرێت نەك هی هاوسەرەكەی؛ چونكە ماوەی (عيدة) حوكمێكی جێگیرە و یەكێكە لە شوێنەوارەكانی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری و ئافرەتەكە لەهەموو كەس زیاتر لێی بە ئاگایە و قسەكەی پێویست بەبەڵگە هێنانەوە ناكات؛ بەڵام هاوسەرەكەی كە دەڵێت تەواو بووە پێویستە بەڵگەی پێ بێت تا پشتڕاستی قسەكەی بكاتەوە.

٥- ئەگەر کەسی قەرزدار گوتی: قەرزەکەم داوەتەوە بە خاوەن قەرزەکە، خاوەن قەرزەکەش ئینکاری کرد و گوتی: نەیداوەمەتەوە، قسەی خاوەن قەرزەکە وەردەگیرێت؛ چونکە کەسی قەرزار لە بنەڕەتدا دان بەبوونی قەرزەکەدا دەنێت، و کاتێك دەڵێت گێڕاومەتەوە پێویستە بەڵگە بۆ قسەکەی بهێنێتەوە.

٦- کەسێك نەخۆش کەوت و وەسیەتی کرد کە پاش مردنی بڕێك پارە بدەن بە کەسێکی تر و پاشان مرد، دواتر میرات گرەکانی وەسیەتەکەیان ڕەت کردەوە و جێبەجێیان نەکرد بە بیانووی ئەوەی کە باوکیان لە کاتی نەخۆشییەکەیدا عەقڵی لەدەست داوە و خەڵەفاوە، قسەکەیان وەرناگیرێت تا بە ڕاپۆرتی پزیشکی یان هەر بەڵگەیەکی تری باوەڕپێکراو پشتڕاستی قسەکەیان نەکەنەوە کە مردووەکە لە کاتی نەخۆشییەکەیدا خەڵەفاوە.

٧- دەڕۆیتە چێشتخانەیەك کە بۆفیەی کراوەی هەیە و بۆت هەیە بە ئارەزووی خۆت خواردن هەڵبژێریت و بخۆیت، زیاد لەوەی کە بۆت دەخورێت بۆت نییە خواردن هەڵگریت و بیبەیتەوە بۆ ماڵەوە یان هەر بە ئارەزوو و بەمەبەستی زیان گەیاندن خەساری بکەیت؛ چونکە ئەو بڕە پارەیەی دەیدەیت بە خاوەنی چێشتخانەکە لەبەرامبەر تێرخواردنی خۆتدایە و هیچی تر و هەر شتێك لەوە زیاتر بێت نە تۆ پارەکەیت نەداوە و نە خاوەنی چێشتخانەکەیش پێی ڕازییە و خواردنی ماڵی کەسیش بەبێ ڕەزامەندی خۆی یان پێدانی بەرامبەرەکەی حەرامە و دروست نییە.

## ڕێسای حەوت

## الأصل براءة الذمة

**واتە:** لەبنەڕەتدا هەموو كەس ئەستۆ پاكە و مافی هیچ كەسێكی تری بەسەرەوە نییە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە پێمان دەڵێت هەموو كەس لە بنەڕەتدا ڕاستگۆ و دەستپاك و دڵپاك و داوێنپاك و بێ تاوان و ئەستۆ پاكە و مافی هیچ كەسێكی تری بەسەرەوە نییە، نە مافی خوای گەورە نە مافی خەڵكانی تر و هەر كەسیش بە پێچەوانەی ئەم ڕێسایەوە بانگەشە یان سكاڵا بكات پێویستی بە بەڵگەیە تا پشتڕاستی قسەكانی بكاتەوە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی سوننەت و قسەی زانایانەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {الْبَيِّنَةُ عَلَى مَنِ ادَّعَى، وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ}. (رواه البيهقي، السنن الكبرى). واتە: هەر كەس سكاڵای ئەوە بكات كە مافی بەسەر كەسێكی ترەوە هەیە پێویستە بە بەڵگە قسەكەی پشتڕاست بكاتەوە. ئەگەر بەڵگەی نەبوو ئەو كات پێویستە كەسی سكاڵا لەسەر كراو سوێند بخوات كە ئەو مافەی لا نییە.

٢- وە دەفەرموێت: {لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، لَادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: ئەگەر هەر كەسێك داوای شتێكی كرد پێی بدرێت، ئەوكات خەڵكانێك داوای ماڵو خوێنی خەڵكی تر دەكەن؛ بۆیە ئەگەر داواكار بەڵگەی نەبوو، پێویستە داوا لەسەر كراو سوێند بخوات كە ئەو مافەی لەسەر نییە.

٣- ئیبن نوجەیم دەڵێت : **(الأصل براءة الذمة، ولذا كان القول قول المدعى عليه لموافقته الأصل، والبينة على المدعي لدعواه ما خالف الأصل)**. (إبن نجيم، الأشباه والنظائر، ص٥٠).

واتە: هەموو كەس لەبنەڕەتدا ئەستۆ پاكە، هەر بۆیە قسەی كەسی سكاڵا لەسەر كراو بەهەند وەردەگیرێت؛ چونكە لەگەڵ ئەو ڕێسایەدا یەك دەكاتەوە كە هیچ كەس مافی بەسەر كەسێكی ترەوە نییە و قسەی كەسی سكاڵاكار وەر ناگیرێت تا بەبەڵگە پشتڕاستی نەكاتەوە؛ چونكە پێچەوانەی ئەو ڕێسایەی پێشووە.

**نموونە:**

١- ئەگەر مانگایەکی ماڵی لە گەڵ گایەکی کێوی جووت بوو، بێچوی ئەم مانگایە زەکاتی لێ ناکەوێت؛ چونکە نیوەی کە پەیوەندی بە مانگا ماڵییەکەوە هەیە زەکاتی دەکەوێت و نیوەکەی دیکەی کە پەیوەندی بە گا کێوییەکەوە هەیە زەکاتی ناکەوێت؛ چونکە جۆرەکەی ساغ نەبۆتەوە کە زەکاتی تێدایە یان نا و بنەڕەتیش ئەستۆ پاکییە.

٢- کەسێکی نێرەمووك کە ڕەگەزەکەی یەکلا نەبۆتەوە، نوێژی بە کۆمەڵ و هەینی و جیهادی لەسەر نییە؛ چونکە ئەمانە ئەرکی پیاوانن و لەسەر ئافرەت پێویست نین و ئەویش ڕەگەزەکەی یەکلا نەبۆتەوە و بنەڕەتیش ئەستۆپاکییە.

٣- هەر کەسێك تۆمەت بار بکرێت بەهەر تاوانێك تا بەڵگەی تەواوی لەسەر نەبێت تۆمەتەکەی بەسەردا ساغ نابێتەوە؛ چونکە بنەڕەت ئەستۆپاکییە.

٤- نوێژ کردن لە پشت هەموو موسوڵمانێکەوە دروستە چەند خراپیش بێت، هەتا ئەو کاتەی بەبەڵگەوە دەسەلمێت کە کەسێکی بێباوەڕ و بێ دینە؛ هەر بۆیە زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی: (ويصلى خلف من يشك فى كفره مالم يتيقن كفره). واتە: نوێژکردن لە پشت هەموو کەسێکەوە دروستە تەنانەت ئەگەر گومانمان لە باوەڕیشی هەبێت تا ئەو کاتەی دڵنیا دەبین لەوەی بێباوەڕە؛ چونکە بنەڕەت ئەستۆ پاکییە.

٥- هیچ گوفتار و هەڵوێستێك نادرێنە پاڵ کەسی بێدەنگ تا بەڵگە پشتڕاستی نەکاتەوە؛ بەڵام بێدەنگی لەکاتی پێویستکردنی هەڵوێستدا بە هەڵوێست ئەژمار دەکرێت، هەر وەك ئەو ڕێسایەی دەڵێت: (لاينسب القول إلى ساكت ولكن السكوت فى معرج الحاجه الى البيان بيان). واتە: هیچ قسەیەك نادرێتە پاڵ کەسی بێدەنگ، بەڵام بێدەنگی لەکاتی پێویست کردنی هەڵوێتسدا هەڵوێستە.

بۆ نموونە: کاتێك پرس بەکچێك دەکەین و بۆچوونی وەردەگرین لەسەر هاوسەرگیری ئەگەر شەرمی کردو بێدەنگ بوو ئەوە نیشانەی ڕەزامەندییە؛ چونکە بێدەنگی لەم جۆرە کاتانەدا کە پێویستی بەهەڵوێستە بە هەڵوێست ئەژمار دەکرێت، یان کاتێك دادوەر تۆمەت ئاڕاستەی تاوان بارێك دەکات، ئەگەر سەری داخست و بێدەنگ بوو وەبەرگری لەخۆی نەکرد، بێ دەنگییەکی بە دانپێدانان ئەژمار دەکرێت.

**٦- هەرکەس نەزری کرد نوێژ بکات یان ڕۆژو بگرێت، بە دوو ڕکات نوێژ یان یەك ڕۆژ ڕۆژوو نەزرەکەی لەسەر لادەچێت؛ چونکە ئەوە کەمترینی ڕێژەی نەزرەکەیە و لەوە زیاتری لەسەر نییە و بنەڕەت ئەستۆ پاکییە.**

**٧- ئەگەر کەسێك گوتی: پارەکانم ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبووە، یان ناگاتە ڕێژەی زەکات، قسەکەی وەردەگیرێت و زەکاتی لێ وەر ناگیرێت؛ چونکە بنەڕەت ئەستۆ پاکییە.**

.

## ڕێسای هەشت
## المشقة تجلب التيسير

**واتە:** بارگرانی ئاسانکاری بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

**گرنگی:** ئەمە یەکێکی ترە لەو پێنج ڕێسا فیقهییە سەرەکییەی کە لە کۆی باس و بابەتە شەرعی و فیقهییەکاندا کاری پێ دەکرێت و سەرچاوەی هەموو ئاسانکارییە شەرعییەکانە و پێمان دەڵێت کە خوای گەورە هیچ کات مەبەستی نییە فەرمانەکان و شەریعەتەکەی ببنە بارێکی قورس بەسەر خەڵکیەوە و بێزاریان بکات، وە هەرکات فەرمانێکی شەرعی سەری کێشا بۆ ئەوە بەهۆی پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو یان نائاساییەوە ئەوکات خوای گەورە ئاسانکاری لەفەرمانە شەرعییەکەدا دەکات بەکەم کردنەوە و کۆکردنەوە و کورتکردنەوە و هەندێك جار بە هەڵگرتنی بەیەکجاری تەنها لەپێناو ئەوەی کە فەرمانە شەرعییەکان خەڵکی بێزار و ناڕەحەت نەکەن، هەر وەك ڕێسا فیقهییەکەی تر پێمان دەڵێت: (لا تكليف إلا بمقدور). واتە: هیچ فەرمانێکی شەرعی لە بەندەکان داواکراو نییە، ئەگەر لە توانایاندا نەبێت؛ هەر بۆیە هیچ فەرمانێکی شەرعیی نییە لە توانای مرۆڤەکاندا نەبێت وپێیان ئەنجام نەدرێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾. (سورة البقرة: ٦٥). واتە: خوای گەورە دەیەوێت ئاسانکارییتان بۆ بکات و نایەوێت ناڕەحەتتان بکات.

٢- وە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ﴾. (سورة النساء: ٢٨). واتە: خوای گەورە دەیەوێت ئاسانکارییتان بۆ بکات.

٣- وە دەفەرموێت: ﴿مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾. (سورة المائدة: ٦). واتە: خوای گەورە نایەوێت ناڕەحەت و بێزارتان بکات.

٤- وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾. (سورة الحج: ٧٨). واتە: خوای گەورە شتێکی لەسەر دانەناون ناڕەحەتتان بکات.

٥- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا، وَلاَ تُنَفِّرُوا}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: ئاسانكاری بۆ خەڵك بكەن و دینیان لەسەر قورس مەكەن، مژدەدەر بن و خەڵكی لە ئیسلام مەترسێنن و مەتارێنن.

٦- خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: {مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ قَطُّ إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: هەر كات پێغەمبەری خودا ﷺ سەرپشك كرابێت لەنێوان دوو كاردا ئاسانەكەیانی هەڵبژاردووە بەمەرجێك تاوان نەبووبێت.

هەموو ئەم دەقانە و دەیەها دەقی تر هەن جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە ئیسلام لەگەڵ ئاسانكاریدایە و هەركات خەڵكی لەبوارێك لە بوارەكاندا تووشی ناڕەحەتی بوون خوای گەورە ئاسانكارییان بۆ دەكات.

**جۆرەكانی بارگرانی:** ئەو بارگرانیانەی كە لەكاتی جێبەجێكردنی پەرستش و فەرمانە شەرعییەكاندا ڕووبەڕووی مرۆڤەكان دەبنەوە دەبن بە دوو بەشەوە:

١- ئەو بارگرانیانەی كە ئاسایی وسروشتین و لەكاتی جێبەجێكردنی فەرمانە شەرعییەكاندا چاوەڕوان كراون و بەشێكن لە خودی پەرستش و ئەركە شەرعییەكان، ئەم جۆرە ناڕەحەتییانە كارئاسانییان بۆ ناكرێت؛ چونكە هەمووان دەزانین كە هیچ پەرستشێك بەبێ ماندوبوون ناڕەحەتی نابێت، وەك تینوێتی و برسێتی لە كاتی ڕۆژوودا، یان ماندوێتی لەكاتی نوێژ و حەجدا، یان زاڵبوون بەسەر حەزی پارە و دونیا ویستی لە كاتی زەكاتدا، یان خۆشی ژیان وخۆشەویستی گیان لەكاتی غەزادا، یان بەسەر ئارەزووەكانی نەفس و حەزەكانی جەستە لەكاتی خۆگرتنەوە لە حەرامەكان. هەموو ئەمانە ناڕەحەتی چاوەڕوانكراویان هەیە و ئاسانكاریشییان بۆ ناكرێت و تا مرۆڤ زیاتر ماندوو بێت لەكردن و جێبەجێكردنیاندا پاداشتی زیاتر وەردەگرێت و وەك ڕێسا شەرعییەكە دەڵێت (الأجر على قدر المشقة). واتە: پاداشت لە قەدەری ماندوبوونە، تا مرۆڤ زیاتر ماندوو بێت پاداشتی زیاتر وەردەگرێت.

٢- ئەو بارگرانیانەی كە نائاسایی و چاوەڕوان نەكراون و بەشێك نین لەپەرستشەكان و بەهۆكارێكی دەرەكی پێش دێن و بەهۆیانەوە بارقورسییەكی زۆر بۆ مرۆڤەكان دروست دەبێت، لەم كاتانەدا خوای گەورە ئاسانكاری بۆ مرۆڤەكان دەكات و بارقورسی

پەرستشەکەیان بۆ سوك دەکات، یان هەر لەسەریان لا دەبات، بۆ نموونە: وەکو گوتمان ڕۆژو برسێتی و تینوێتی هەیە و ئەمەیش شتێکی چاوەڕوان کراوە، بەڵام بۆ ئافرەتێکی دووگیان نارەحەتییەکان دوو هێندەیان لێ دێت و ئەمەیش ئەگەرێکی چاوەڕوان نەکراوە؛ هەر بۆیە خوای گەورە ئاسانکاری بۆ دەکات و حوکمە شەرعییەکەی لەسەر لادەبات و ئەو مافەی پێ دەدات کە بەڕۆژوو نەبێت و هەرکات سکەکەی دانا و ژیانی ئاسایی بویەوە ئەو کات ڕۆژووەکەی دەگرێتەوە. یان لەش ساغێك دەتوانێت بەڕۆژو بێت و بەرگەی تێنوێتی و برسێتی بگرێت، بەڵام کە نەخۆش کەوت سەرباری تینوێتی و برسێتییەکەی ئازار و لاوازیشی دێتە سەر و ئەمەیش پەیوەندی بە پەرستشەکەوە نییە؛ بۆیە خوای گەورە مافی ئەوەی پێ دەدات بەڕۆژو نەبێت و نوێژەکانیش کۆ بکاتەوە.

**هۆکارەکان:** ئەو هۆکارانەی ئاسانکاری شەرعی بەدوای خۆیاندا دەهێنن بریتین لە:

١- ڕێبواری و گەشت **(السفر)**: لەو ئاسانکارییانەی بەدوای خۆیدا دەیهێنێت: کورت کردنەوە و کۆکردنەوەی نوێژ، بەڕۆژو نەبوون، نوێژی هەینی نەکردن، مەسح کردن بەسەر خوف و گۆرەویدا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، کردنی نوێژی سوننەت لەناو ئۆتۆمبێل و تەیارە و سەرجەم هۆکارەکانی تری گواستنەوەدا.

٢- نەخۆشی **(المرض)**: لەو ئاسانکارییانەی بەدوای خۆیدا دەیهێنێت: بەڕۆژو نەبوون، بەکار نەهێنانی ئاو و تەیەموم کردن بۆ نوێژ کردن، کۆکردنەوەی نوێژەکان و نەڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی و نوێژە بەکۆمەڵەکان، نوێژ کردن بەدانیشتنەوە یان بەپاڵکەوتنەوە، بریکار گرتن بۆ ڕاپەڕاندنی زۆرێك لەکارەکانی حەج.

٣- زۆرکردن **(الإكراه)**: لەو ئاسانکارییانەی بەدوای خۆیدا دەیهێنێت: پوچەڵکردنەوەی هەموو ئەو گوفتار و ڕەفتارانەی کە کەسی زۆرلێکراو لەژێر فشاردا ئەنجامی دەدات تەنانەت ئەگەر کوفریش بکات.

٤- لەبیرچونەوە **(النسیان)**: لەو ئاسانکارییانەی بەدوای خۆیدا دەیهێنێت: لێبوردن لە هەر تاوان و سەرپێچییەك کە بەهۆی لەبیرچوونەوەوە دروست دەبێت.

٥- نەزانین **(الجهل)**: ئەمیش یان بەهۆی نەزانینی خودی حوکمە شەرعییەکەوە دروست دەبێت، یانیش بەهۆی نەزانینی لێکەوتەکانییەوە دروست دەبێت، لەو

ئاسانکارییانەیش کە بەدوای خۆیدا دەیهێنێت: لێبوردن لە هەر تاوان و سەرپێچییەك کە بەهۆی نەزانینەوە دروست دەبێت؛ بەڵام بەمەرجێك نەزانینەکە بەپێی پێودانگە شەرعییەکان ڕێگەپێدراو بێت، ئەگەر نا هەر نەزانینێك نابێتە پاساوی لێنەگرتن و لێخۆشبوون.

٦- قورسی و ئاستەم بوونی خۆ پاراستن (العسر): هەندێك کێشە هەیە مرۆڤ ئاستەمە بتوانێت خۆی لێ بپارێزێت، لەو ئاسانکارییانەی ئەم حاڵەتە بەدوای خۆیدا دەیهێنێت، چاوپۆشی کردنی شەرعە لەو جۆرە حاڵەتانە و گرتنی ڕێکاری ئاسانترە لەگەڵ ئەو جۆرە خەڵکانە.

بۆ نموونە: کەسێك نەخۆشی میزەچرکەی هەیە، یان ئافرەتێك بەردەوام یان زۆربەی کات کێشەی نەزیفی خوێنی هەیە (الإستحاضة)، یان کەسێك بەردەوام بای لێ دەبێتەوە، هیچ کام لەم جۆرە کەسانە ناتوانن دستنوێژەکانیان ڕابگرن، یان خۆیان پاك ڕابگرن؛ بۆیە لەم حاڵەتانەدا شەرع مەجی ئەوە دادەنێت کە کەسەکان بۆ هەموو نوێژێکی فەرز دوای بانگ دان بۆ نوێژەکە دەستنوێژەکەیان تازە بکەنەوە، دواتر هەرچی ڕوو بدات بەهۆی ئەو نەخۆشیانەوە دەستنوێژەکەی پێ ناشکێت و کەسەکە دەتوانێت بە ئاسایی نوێژی خۆی بکات.

ئاسانکارییەکان: ئەو ئاسانکارییانەی کە شەرع دەیکات لە کاتی نارەحەتییەکاندا بریتین لە:

١- لابردنی پەرستشەکان: وەك هەڵگرتنی نوێژ لەسەر ئافرەت لەکاتی سووڕی مانگانەدا، یان هەڵگرتنی حەج و جیهاد و عەمرە و نوێژی هەینی و چەندین پەرستشی تر لە کاتی بوونی پاساوە شەرعییەکاندا.

٢- کەم کردنەوە و کورت کردنەوەیان: وەك کورتکردنەوەی نوێژ لە کاتی سەفەردا یان ترسدا.

٣- پێشخستن یان دواخستنیان بەپێی پێویست: وەك ڕێگەدان بە کۆکردنەوەی نوێژەکان لەکاتی سەفەر یان باران و سەرمای زۆر یان نەخۆشیدا، وە ڕێگەدان بە پێشخستن

یان پاشخستنی زەکات لەکاتی پێویستدا، وەك ڕوودانی بومەلەرزە و لافاو و کارەساتە سروشتییەکان.

٤- گۆڕینی حوکمە شەرعییەکان: وەك ڕێگەپێدان بە گۆڕینی حوکمی دەستنوێژ بۆ تەیەموم کردن لەکاتی نەخۆشی یان نەبوونی ئاو یان نەتوانینی بەکارهێنانیدا، وە گۆڕینی حوکمی کەفارەتی سوێند لە خواردن و پۆشاك و ئازاد کردنی کۆیلەیەك، بۆ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوون ئەگەر هیچ کام لەوانەی پێشووی نەتوانرا.

٥- ڕێگەدان بەکردنی حەرامەکان لەکاتی ناچاری و زۆر پێویستدا: وەك ڕێگەدان بە خواردنی گۆشتی بەراز یان ئاژەڵی مدارەوەبوو لە کاتی برسێتی زۆردا کەترسی مردنی لێ بکرێت. وە ڕێگەدان بەکوفر کردن لەبوونی مەترسی کوشتندا.

ئەمانە هەمووی ئاسانکارین کە خوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی دەکات تا کەس بیانووی ئەوەی نەمینێت کە فەرمانەکانی خوای گەورە و شەریعەتەکەی جێبەجێ نەکات؛ هەر بۆیە خوای گەورەیش لە قیامەت پاساو لە هیچ کەس قبوڵ ناکات، چونکە لە دونیا بواری پاساوهێنانەوە و بیانوی بۆ هیچ کەس نەهێشتۆتەوە.

**ڕێکارە شەرعییەکان:** پێشتر گوتمان کە ئەم ڕێسایە ڕێسایەکی گرنگ و گشتگیرە و لەسەرجەم بابەتە فیقهییەکاندا کاری پێ دەکرێت؛ بەڵام لەو گرنگتر ئەوەیە کە مەرج و ڕێکارە شەرعییەکانی کارپێکردنی ڕێساکە بزانین، تا لەکاتی جێبەجێکردنیدا نەکەوینە هەڵەوە، گرنگترینی ئەو مەرج و ڕێکارانەیش بریتین لە:

١- ئەو نارەحەتییەی کە باسی دەکەین ڕاستی بێت و لە ئێستادا بوونی هەبێت ئەوجا ڕێسای (المشقة تجلب التيسير). کاری پێ دەکرێت، خۆ ئەگەر تەنها گومان بێت یان پێشبینی کراو بێت ئەو کات ئەو ڕێسایە نایگرێتەوە، بەڵکو بە ڕێسای: (الرخص لا تناط بأمر موهوم) واتە: ئاسانکارییە شەرعییەکان بۆ شتی گوماناوی ناکرێن. مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

بۆ نموونە: کەسێك نەخۆشبێت و زۆر نارەحەت بێت یان پزیشکەکان پێی بڵێن: ئەگەر بەڕۆژو بێت زۆر نارەحەت دەبێت و زیانی زۆری پێ دەگات، دەتوانێت بەڕۆژوو نەبێت؛ بەڵام ناکرێت کەسێك بڵێت: بەڕۆژو نابم لەبەر ئەوەی دەترسم ئەگەر بەڕۆژو بم نەخۆش بکەم، ئەوە نابێتە پاساوی شەرعی و ئەم ڕێسایە نایگرێتەوە.

یان كەسێك بەرنامەی سەفەركردنی هەبێت ناكرێت هێشتا لەشارەكەی خۆی دەرنەچووە نوێژەكانی كورت بكاتەوە؛ بەڵكو كەی كەوتە سەفەرەكەوە لەو كاتەوە دەتوانێت نوێژەكانی كورت بكاتەوە.

یان كەسێك برسی بێت بۆی نییە یەكسەر گۆشتی بەراز یان مردارەوەبوو بخوات تا تەواو برسێتی زۆری بۆ نەهێنێت و هیچی حەڵاڵی دەست نەكەوێت بیخوات، ئەو كات بۆی هەیە گۆشتی حەرام بخوات.

٢- ئاسانكارییەكە دەقی شەرعی لەسەر هەبێت و ڕێگە پێدراو بێت، ئەگەر نا بەتاوان ئەژمار دەكرێت و دروست نییە مرۆڤ پەنای پێ ببات، هەر وەك لەفەرموودەكەی خاتوو عایشەدا هاتووە: {مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ قَطُّ إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: هەر كات پێغەمبەری خودا ﷺ سەرپشك كرابێت لەنێوان دوو كاردا ئاسانەكەیانی هەڵبژاردووە بەمەرجێك تاوان نەبووبێت.

بۆ نموونە: نوێژ لەكاتی سوڕی مانگانە یان بوونی خوێنی پاش منداڵبوون لەسەر ئافرەتان لا دەچێت؛ بەڵام بۆ پیاوان هەرگیز لاناچێت و هیچ پاساوێكیش بۆ نەكردنی نییە، دەكرێت كۆ بكرێنەوە، یان كورت بكرێنەوە، یان بەدانیشتن، یان بەپاڵكەوتن، یان تەنها بە ئاماژەی سەر یان چاو یان دڵ بكرێن، بەدەستنوێژەوە یان بە تەیەموم یان هەرچۆن دەستی دا بكرێن، بەڵام نەكردنی نییە و بەهیچ شێوەیەك ڕێگەپێدراو نییە.

٣- ئاسانكارییەكە گشتگیر بێت و ئەگەری ڕوودانی زۆربێت و هەموو كەس بگرێتەوە؛ چونكە ئاسانكاری بۆ حاڵەتی دەگمەن ناكرێت. هەر وەك ڕێسا فیقهییەكە دەڵێت: (لا حرج في النوادر). واتە: نارەحەتی لە حاڵەتی دەگمەندا ئەژمار ناكرێت، وەك ئەوەی كەسێك ماوەیەكی زۆر دەچێتە حاڵەتی كۆماوە و لەهۆش خۆی دەچێت كەی هاتەوە هۆش خۆی دەبێت نوێژ و پەرستشەكانی بكاتەوە و هیچ ئاسانكارییەك ئەم حاڵەتە ناگرێتەوە؛ چونكە ئەم حاڵەتە دەگمەنە و بەكەمی ڕوو دەدات و خەڵكانێكی زۆر كەم تووشی دێن.

٤- ئاسانكارییەكە بۆ كاری شەرعی و ڕێگە پێدراو بێت؛ چونكە شەرع ئاسانكاری بۆ كاری حەرام و ئامانجی ناشەرعی ناكات، وەك ڕێسا فیقهییەكە دەڵێت: (الرخص لا تناط بالمعاصي). واتە: ئاسانكارییە شەرعییەكان كاری حەرام ناگرێتەوە. وەك ئەوەی كەسێك

سەفەر بكات بەمەبەستی دزی كردن یان بۆ كاری بەد و داوێنپیسی ناتوانێت لەڕێگە نوێژەكانی كورت یان كۆ بكاتەوە یان بەڕۆژو نەبێت؛ چونكە ئەوانە ئاسانكاریی شەرعیین و ناكرێت شەرع ئاسانكاری بۆ كەسێك بكات كە دەیەوێت حەرامێك ئەنجام بدات.

٥- نابێت مەبەستی كەسەكە لە كارەكەی خۆدزینەوە بێت لە حوكمە شەرعییەكان: وەك ئەوەی كەسێك كە ڕەمەزان دەكەوێتە هاوینەوە و دونیا گەرمە و ڕۆژگار درێژە سەفەر بكات تەنها بۆ ئەوەی بەڕۆژوو نەبێت و دواتر لە زستاندا كە دونیا ساردە و ڕۆژگار كورتە بیگرێتەوە، ئەم كەسە ئەگەر چی لە سەفەریشدا بێت پێویستە بەڕۆژوو بێت، یان كەسێك پارەی زەكاتی هەیە و لە مانگی ڕەمەزاندا زەكاتی پارەكانی دەردەكات، لە مانگی شەعباندا بەهاوسەرەكەی یان هاوڕێیەكی بڵێت: ئەم پارەیە بۆ تۆ، ئەویش قبوڵی بكات، ئێستا پارەكە موڵكی ئەو پیاوە نییەو موڵكی ژنەكەیەتی و تا ساڵێكی دیكە زەكاتی لێناكەوێت، بەهۆی ئەوەی ژنەكە تازە پارەی دەست كەوتوە و ساڵی بەسەردا نەڕۆیشتوە و زەكاتی لێ نادرێت، پاش یەك دوو مانگ ژنەكە دیسان پارەكە دەداتەوە پیاوەكە و پیاوەكەش زەكاتی لێ نادات چونكە تازە دەستی كەوتوە و ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبووە بۆیە زەكاتی ناكەوێت، ئەم جۆرە كەسانە زەكاتی ماڵەكانیان لەسەر ناچێت و پێویستە لەكاتی خۆیدا زەكاتی پارەكانیان بدەن.

لەسەردەمی پێشەوا عومەردا لەیەمەن كۆمەڵێك ڕۆشتن بۆ كوشتنی پیاوێك گوتیان بە دەستە جەمعی دەیكوژین و ئەو كات ئەگەر كوشتمان حوكمی شەرعمان بەسەردا جێبەجێ نابێت و ناكوژرێینەوە؛چونكە لەشەرعدا خوێنی مرۆڤێك هەر مرۆڤێكە و ئێمەیش بەكۆمەڵ كوشتومانە، كاتێك كێشەكە گەیشتەوە لای پێشەوا عومەر فەرمانی كرد هەموویان بكوژرێن و پاشان گوتی: وەڵڵاهی ئەگەر هەموو خەڵكی صەنعا - نەك كۆمەڵێك- دەستیان هەبووبێت لە كوشتنی ئەو پیاوەدا هەموویان دەكوژمەوە. تا خەڵكی ئەوە نەكەنە پاساو بۆ خۆ دەرباز كردن لە حوكمە شەرعییەكەی.

٦- وەرگرتنی ئاسانكارییەكە تەنها بەهۆی پاساوە شەرعییەكانەوە بێت نەك شتێكی تر، بۆ نموونە: كەسێك نەخۆشە بەڵام لەوانەیە بتوانێت بەڕۆژوو بێت و كێشەیشی نەبێت؛

بەڵام ئەم نەخۆشییەکەی دەکاتە بیانوو، ئەگەر نا هەر لەبەر تەمەڵی یان چلێسی یان خەمساردی خۆی بەڕۆژوو نابێت.

ئەم ڕێسایەی باسمان کرد (المشقة تجلب التيسير). بەپێی ئەم ڕێکار و مەرجانە کاری پێ دەکرێت، نەك هەر کەسێك هەستێت و بۆ خۆی فەتوا بدات و کارئاسانی شەرعیی بۆ خۆی بکات.

**نموونە:**

١- کەسێك لە حەج بێت پێویستە لەکاتی نوێژدا تەواو ڕووی لە کەعبە بێت، بەڵام ئەگەر لە سلێمانی نوێژی کرد یان هەر شوێنێکی تر کە ئاستەمە تەواو دڵنیا بێت لەوەی کە ڕووی لە کەعبەیە یان نا، ئەوە تەنها ڕووی لە ئاراستەی کەعبە بێت دروستە و ئیتر پێویست نییە دەقاودەق ڕوی لە عەینی کەعبە بێت؛ چونکە دڵنیا بوون لەو کارە ئاستەمە و مەحاڵە.

٢- هەموو ئەرکە داراییەکان لە نموونەی حەج و زەکات و پارەی کەفارەتی ڕۆژو ..... هتد. لەسەر هەژاران پێویست نین و ناچار ناکرێن لەسەر کردنی.

٣- کەسێك نەزری کرد کارێك بکات کە لە توانایدا نییە نەزرەکەی دانامەزرێت و لەسەری قەرزدار نابێت و لەبری ئەوە کەفارەتی سوێندێك دەدات.

٤- هەر کەسێك کارێکی ناپەسەندو حەرامی بینی، پێویستە بەپێی توانا ڕێگری لی بکات و بیگۆڕێت، ئەگەر توانی بەدەست ئەگەر نا بە زمانی ئەگەر نا تەنها بەدڵ پێی ناخۆشبێت بەسە و ئەرکەکەی لەسەر لا دەچێت.

٥- کەسێك بەڕۆژوو بێت نابێت هیچ خواردن و خواردنەوەیەك بەقوڕگیدا بڕوات، بەڵام کەسێك لە نانەوادا کار دەکات، بە ناچاری تۆزی ئاردەکە هەڵدەمژێت و دەچێت بە قورگیدا، ئەمە ڕۆژووەکەی بەتاڵ ناکاتەوە؛ چونکە ئاستەمە بتوانێت خۆی لێ بپارێزێت.

٦- ئافرەتێك لە کاتی حەجدابوو، ڕۆژی جەژن کە پێویستە تەوافی ئیفاضە بکات، ئافرەتەکە کەوتە سوڕی مانگانەوە، بەو حاڵەیشەوە ناتوانێت هیچ طەوافێك بکات نە ئیفاضە و نە ماڵ ئاوایی و بلیتی فڕۆکەکەشی چەند ڕۆژێکی ماوە و هاوەڵەکانی و فڕۆکەکەی بەجێێ دەهێڵن و دەوڵەتی سعودیش ڕێگە بەمانەوەی نادات، ئەم ئافرەتە

دەکەوێتە نێوان ئەگەرەکانی ئەوەی چاوەڕوان بکات تا لە سوڕی مانگانەکەی پاك دەبێتەوە و ئەوجا طەواف بکات تا ئەو کاتەیش بلیتی فرۆکەکەی دەفەوتێ و هاوڕێکانی بەجێی دەهێڵن و تووشی لێپێچینەوەی یاساییش دەبێت، یان ئەوەتا بگەڕێتەوە و حەجەکەی بفەوتێ، یانیش ئەوەتا بە سوڕی مانگانەوە طەواف بکات و سەرجەم کارەکانی حەجی تەواو بکات؟! ئەگەری کۆتاییش باشترین و پەسەندترینیانە.

٧- چارەسەر کردنی نەخۆش پێویستە لەسەر داوا و بەمۆڵەتی کەسی نەخۆش خۆی یان کەسوکاری بێت، بەڵام ئەم خاڵە لە حەڵەتی ناچاری و کتوپڕی و مەترسیدار ڕەچاو ناکرێت و چارەسەری خێرا بۆ ئەو جۆرە نەخۆشانە دەکرێت بێ وەستان و چاوەڕوانی مۆڵەتی کەس.

٨- نەشتەرگەری جوانکاری بۆ حاڵەتی ئاسایی دروست نییە و ڕێگەی پێ نادرێت، بەڵام بۆ هەندێك حاڵەتی نا ئاسایی ڕێگەی پێ دەدرێت، وەك: بەکار خستنەوەی ئەندامێکی لەکار کەوتوو، یان چاك کردنەوەی ئەندامێکی شێواو بەهۆی نەخۆشی یان ڕووداوێکەوە، یان ڕێك کردنەوە و ئاسایی کردنەوەی ئەندامێك کە هەر لە زکماکەوە ناشیرینە و بۆتە مایەی لەکەدارکردن یان ناشیرینکردنی خاوەنەکەی.

٩- دروست نییە قورئان یان ناوی خوای گەورە ببرێتە سەرئاو و ناو تەوالێتەوە؛ بەڵام ئەگەر هەر یەك لەوانە لە ناو مۆبایلدا هەبوون، یان لەسەر پارە و دراو هەبوون، ئاساییە ببرێنە تەوالێت.

هەموو ئەم حاڵەتانە و بەسەدەها حاڵەتی تر هەن کە شەرع لەبەر هەڵگرتن و لابردنی نارەحەتی لەسەر مرۆڤەکان ڕێگەیان پێ دەدات، ئەگەر نا لە بنەڕەتدا ڕێگەپێدراو نین.

## ڕێسای نۆ

## الضرورات تبيح المحظورات

**واتە:** ناچارییەکان حەرامەکان حەڵاڵ دەکەن.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە ڕەنگدانەوەی جێبەجێکردنی ڕێسای پێشوە و بەشێکە لەو ئاسانکارییانەی کە خوای گەورە بۆ مرۆڤەکانی دەکات لە کاتی ناچاریدا، کاتێك ڕێگەیان پێ دەدات کە پەنا بەرنە بەر کردنی حەرامەکان تا گیان و ژیانیان پارێزراو و سەلامەت بێت، تەنانەت ئەگەر ئەو حەرامانە کوفر و شیرکیش بن؛ چونکە مەبەستی سەرەکی فەرمانە شەرعییەکان تاقیکردنەوەی ڕێژەی گوێڕایەڵی مرۆڤەکانە نەك خودی کارەکان، ئەمەیش بەو کارانە دەبێت کە لەتوانایاندا بێت بیکەن، ئەگەر نا کارێك لەتوانای کەسدا نەبێت بیکات ناشبێتە پێوەری تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی باش و خراپی مرۆڤەکان. هەربۆیە لەو کاتانەدا خوای گەورە کارئاسانی بۆ مرۆڤەکان دەکات و حوکمەکانیان لەسەر هەڵدەگرێت تا ئەو کاتەی بارودۆخەکانیان ئاسایی دەبنەوە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾. (سورة البقرة: ١٧٣). واتە: خوای گەورە خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو و خوێنی خاو و گۆشتی بەراز و هەر ئاژەڵێك بۆ بتەکان سەربڕدرابێت یان لەکاتی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێت حەرامکردوە لەسەرتان، هەر کەسێکیش ناچار بوو وە ژیانی کەوتە مەترسییەوە بۆی هەیە لەو حەرامانە بخوات و تاونبار نابێت بەمەرجێك زیادە ڕەوی تێدا نەکات.

٢- وە دەفەرموێت: ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ بَعْدَ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ﴾. (سورة النحل: ١٠٦). واتە: هەر کەس کوفر بکات بە خوای گەورە پاش ئەوەی باوەڕی پێی هێناوە، مەگەر کەسێك نەبێت کە دڵی دامەزراو بێت لەسەر ئیمان و بەزۆر کوفریان پێ کردبێت، ئەو کەسانە بەکوفرەکەیان کافر نابن و تاوانبار نابن.

٣- ئەنەسی كوڕی مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف و زوبێری كوڕی عەووام هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ و سكاڵایان كرد و گوتیان: ئەسپێ تێی داوین، جا ڕێگەمان پێدەدەیت ئاوریشم لەبەر كەین، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی پێدان. ئەمە لەكاتێكدا كە پێغەمبەری خودا ﷺ پێشتر پێی فەرموو بوون كە لەبەركردنی ئاوریشم بۆ پیاو حەرامە و درووست نییە؛ بەڵام بۆ ئەمان ڕێگەی پێدا لەبەر ناچاری.

**مەرج و ڕێكارە شەرعییەكان:** بەو پێیەی ئەم ڕێسایە ڕێسایەكی هەستیارە و پەیوەندی بەهەڵگرتنی حوكمی حەرامەكانەوە هەیە و لەوانەیە هەندێك كەس كەمتەرخەمی یاخود زێدەڕەوی تێدا بكەن؛ شەریعەت كۆمەڵێك مەرج و ڕێكاری بۆ داناوە كە پێویستە لەكاتی جێبەجێكردنی ڕێساكەدا ڕەچاوبكرێن لەوانە:

١- ئەو كارە حەرامە بە ئەندازەی لاچوونی ناچارییەكەی بەكار بهێنرێت و زێدەڕەوی تێدا نەكرێت، هەر وەك ڕێسا شەرعییەكە دەڵێت: **(الضرورات تقدر بقدرها)**. واتە: ناچارییەكان هێندەی نەمانی ناچارییەكان ڕێگەیان پێ دەدرێت؛ چونكە بەنەمانی ناچارییەكە حوكمە شەرعییەكە دەچێتەوە دۆخی خۆی و حەرام دەبێتەوە، وەك ڕێسا شەرعییەكەی تر دەڵێت: **(ما جاز لعذر بطل بزواله)**. واتە: هەر شتێك لەبەر پاساوێك ڕێگەی پێدرا، بەنەمانی پاساوەكە ڕێگە پێدانەكەیش كۆتایی دێت، یان وەك ڕێساكەی تر دەڵێت: **(إذا زال المانع عاد الممنوع)**. واتە: ئەگەر ڕێگرییەكە نەما ڕێلێگیراوەكە وەك خۆی لێدێتەوە.

بۆ نموونە: كەسێك خەریكە لە برسا دەمرێت و جگە لەگۆشتی مرداروەبوو هیچ خواردنێكی حەڵاڵی دەست ناكەوێت بیخوات، بۆی هەیە هێندەی لێ بخوات تا لەمردن ڕزگاری بێت بەڵام نەك تێری لێ بخوات.

٢- زیان و تاوانی ئەو كارە حەرامەی كەدەیكات لەزیانی نەكردنی كەمتر بێت:

بۆنمونە: كەسێك هەڕەشەی كوشتن لەكەسێك دەكات ئەگەر كەسێكی بێ تاوانی بۆ نەكوژێت، لەم حاڵەتەدا كەسی زۆرلێكراو بۆی نییە كەسەكە بكوژێت بە بیانوی ڕزگاركردنی ژیانی خۆی؛ چونكە ژیانی ئەم و بەرامبەرەكەی جیاوازییان نییە وئەم بۆی نییە لەپێناو

ڕزگارکردنی ژیانی خۆیدا ژیانی کەسی تر بخاتە مەترسییەوە و کوشتنیش هەر کوشتنە و باشتر وایە ئەم بەستەملێکراوی بکوژرێت نەك ببێتە ستەمکارێکی بکوژ؛ بەڵام ئەگەر هەڕەشەی کوشتنی لێ بکەن ئەگەر عارەق نەخوات ئەو کات باشتر وایە عارەق بخوات نەك بکوژرێت؛ چونکە تاوانی عارەق خواردن لە تاوانی کوشتن کەمتر و ئاسانترە.

٣- کەسەکە جگە لەکردنی حەرامەکە هیچ بژاردەیەکی تری ڕێگەپێدراوی لەبەردەستدا نەبێت پەنای بۆ ببات:

بۆ نموونە: کەسێك پێویستی زۆری بەپارەیە و ژیانی خۆی یان کەسێکی زۆر نزیکی لە مەترسیدایە و کەس نییە بەخێر یان زەکات یان قەرز پێی بدات و خۆیشی هیچی نییە تا بیفرۆشێت و لەو ڕێیەوە پارەی دەست کەوێت، ئەم کەسە بۆی نییە قەرز بەسوو وەرگرێت تا ڕێگەی سواڵکردنیش تاقی نەکاتەوە، ئەگەر سواڵی کرد و کەس پێی نەدا و حاڵەتی ناچارییەکیشی هەر بەردەوام بوو ئەو کات بۆی هەیە هێندەی لاچوونی ناچارییەکەی قەرز بەسوو وەربگرێت.

٤- حاڵەتی پێویستی و ناچارییەکە لە ئێستادا و کاتی کردنی حەرامەکە بوونی هەبێت و واقیع بێت نەوەك تەنها ئەگەر یان پێشبینی کراو بێت:

بۆ نموونە: کەسێك گومانی هەیە ئەگەر بکەوێتە دەستی بێباوەڕان بەزۆر ناچاری بکەن کوفر بکات، لە ئێستادا و تەنها بەم گومانە بۆی نییە کوفر بکات؛ چونکە حەرامەکان بە گومان حەڵاڵ نابن و بەس خوای گەورە خۆیشی دەزانێت ئەو حاڵەتە هەر ڕوو دەدات یان نا.

٥- دەبێت پاساوی کردنی حەرامەکە تا کۆتایی کردنی حەرامەکە بەردەوام بێت: لەبەر ئەوەی ڕێسایەکی شەرعی ترمان هەیە دەڵێت: (الدوام كالإبتداء). واتە: بەردەوام بوون هەمان حوکمی سەرەتای هەیە؛ هەر بۆیە ئەگەر سەرەتا ناچار بووین پەنا بەرینە بەر کارێکی حەرام؛ بەڵام بەر لەکردنی حەرامەکە حاڵەتی ناچارییەکە نەما یاخود بژاردەی حەڵاڵمان بەردەست کەوت و پێویستمان بە حەرامەکە نەما، ئەو کات حوکمی حەرامەکە دەگەڕێتەوە و وەك خۆی لێدێتەوە و بەکارهێنانی بەهیچ شێوەیەك دروست نییە.

بۆ نموونە: كەسێك زۆری برسی بوو هیچی دەست نەكەوت بیخوات جگە لەگۆشتی بەراز نەبێت، گۆشتی بەرازەكەی ئامادە كرد كە بیخوات، بەڵام بەر لەوەی بیخوات خواردنێكی حەڵاڵی دەسكەوت ئیتر بۆی نییە گۆشتی بەرازەكە بخوات؛ چونكە پاساوی خواردنەكەی نەماوە و لاچووە.

**نموونە:**

١- ئافرەتێك توشی ئازارێكی لەناكاو دەبێت و شوێنی ئازارەكە لەوانەیە جێی مەترسی بێت، كاتێك دەیبەینە خەستەخانە جگە لەپزئشكی پیاو هیچ پزیشكێكی ئافرەتی لیَ نییە تا پشكنینی بۆ بكات، ئێستا ئەم پزیشكە پیاوە بۆی هەیە بەپێی پێویست سەیری جەستەی ئەم ئافرەتە بكات و دەستی تێوە بدات و پشكنین و چارەسەری گونجاوی بۆ بكات، بەلاَم زیاد لەپێویست نا، خۆ ئەگەر ئازارەكە جێی مەترسی نەبوو یاخود پزیشكی پسپۆڕی ئافرەت هەبوو ئەو كات بەهیچ شێوەیەك پزیشكێكی پیاوی نا مەحرەم بۆی نییە پشكنینی بۆ بكات.

٢- كەسێك بە ناحەق پەلامارت دەدات و شەڕت لەگەڵ دەكات و تۆیش چەكت پێیە، هەتا زۆر ناچار نەبیت و ژیانت نەكەوێت مەترسییەوە بۆت نییە تەقەی لی بكەیت، ئەگەر هەر ناچار بوویت ئەو كات بۆت هەیە تەقەی لیَ بكەیت بەلاَم بەپێی پێویست و ئەوەندەی كە ژیانی خۆت ڕزگار بكەیت، نەك ئەو بكوژیت. واتە یەك فیشەك دەنێیت بە زەوییەكەوە یان بەئاسمانەوە تا بگەڕێتەوە ئەگەر نەگەڕایەوە دەینێیت بە قاچییەوە تا نەتوانێت هێرشت بكاتە سەر؛ بەلاَم بەهیچ شێوەیەك بۆت نییە بە بیانوی بەرگری لەخۆ كردن لەسەر و سنگی بدەیت، چونكە مەترسییەكە لەسەر ژیانی تۆ بەیەك خستنی لادەچێت بۆیە كوشتنی ڕێگەپێدراو نییە.

٣- لە وڵاتێكی ئیسلامییدا كە بانكی ئیسلامی لێیە كەس ناچار نییە پارە لەبانكێكدا دابنێت كە بەسوو مامەڵە دەكات؛ بەلاَم ئەگەر لەوڵاتێكدا بووین كە هیچ بانكی ئیسلامی لیَ نەبوو وە ناچار بووین پارەكانمان لەبانكێكدا دابنێین كە بەسوو مامەڵە دەكات، ئەو كات نابێت بەو شێوازە داینێین كە سووی دەچێتە سەر، ئەگەریش بەهەموو شێوازێك سووی دەچووە سەر، ئەوكات ئاساییە داینێن و هەر سوویەكی چووە سەر باشتر وایە وەری بگرین

و بۆ بانکەکەی جێ نەهێڵین؛ چونکە بانك دیسان دەیداتەوە بەسوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك بۆمان نییە پاری سووەکە بۆ بەرژەوەندی خۆمان بەکار بهێنین؛ بەڵکو دەبێت بیدەین بەخەڵکی هەژار و کەم دەرامەت و پرۆژەی خەیری، وە بشزانین کە هیچ خێرمان ناگات چونکە خێر بەپارەی حەرام ناکرێت؛ بەڵکو حەرامێکە و لەملی خۆمانی دا دەماڵین.

٤- کەسێك قەرزی لای کەسێکە نایداتەوە، خاوەن قەرزەکە بۆی هەیە هەر کات پارەی قەرزدارەکەی بەردەست کەوت بڕی قەرزەکەی خۆی لێ هەڵبگرێتەوە بەبێ ئەوەی پرسی بێ بکات یان مۆڵەتی لێ وەربگرێت.

٥- کەسێك دەستی بسوتێت یان بریندار بێت، ڕێگە دەدەین ئەو شوێنە بپێچێت و لەزگەی لێبدات و بۆ کاتی دەستنوێژ یان خۆشۆردن تەڕی نەکات و تەنها دەستی تەڕ بەسەر برینپێچەکەدا بهێنێت، بەڵآم بەمەرجێك تەنها ئەو شوێنە بپێچرێت کە پێویستی بە پێچان هەیە، بۆ نموونە کەسێك یەك پەنجەی بریندارە، بۆی هەیە تەنها ئەو پەنجەیەی بپێچێت و مەسحی بکات نەك هەموو دەستی.

٦- باس کردنی پاش ملە دروست نییە و دەبێتە غەیبەت؛ بەڵام لە هەندێك حاڵەتدا ڕێگەپێدراوە، وەك سکاڵاکردنی کەسێك کە مافی خواردویت لای دادوەرێك یان دەستڕۆیشتویەك تا مافەکەت بۆ وەربگرێتەوە، یان لای کەسێکی تر کەدەزانیت لەوانەیە ئەویش وەك تۆ بەنەزانی تێکەڵی ئەو کەسە بکات و مافی بخوات، یان کەسێك خۆی دێت بۆ لات و پرسیاری ئەو کەسەت لێ دەکات، لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا بۆت هەیە باسی خراپییەکانی ئەو کەسە بکەیت بەبێ زیاد و کەم، بەڵام ئەگەر مەبەستەکە تەنها ناوزڕاندن و سوکایەتی پێکردن بێت، ئەوە بەهیچ شێوەیەك دروست و ڕێگەپێدراو نییە.

هەموو ئەم نموونانەیش کە باسمان کرد و هەر بابەتێکی تریش کەدەچێتە خانەی ئەم ڕێسایەوە دەبێت بەپێی ئەو ڕێکار و مەرجە شەرعییانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت کە پێشتر باسمان کردن.

## ڕێسای دە

## إذا زال المانع عاد الممنوع

**واتە:** ئەگەر ڕێگر لە حوکمە شەرعییەکە لاچوو، ڕێلێگیراوەکە وەك خۆی لێ دێتەوە.

**گرنگی:** ئەمە یەکێکی ترە لەو ڕێسایانەی کە لە پێناو ئاسانکاری کردن بۆ ژیانی مرۆڤەکان و هەڵگرتنی بەربەست و ناڕەحەتییەکانی ژیانیان دانراوە و مەبەست لە ڕێساکە ئەوەیە کە هەرکارێك لەشەرعدا فەرمانپێکراو یان ڕێگەپێدراو بوو، دواتر بەربەست یان ئاستەنگێکی بۆ دروست بوو، لەو کاتانەدا مرۆڤەکان ئەو ئەرکانە جێبەجێ ناکەن و هەر کات بەربەستەکە لاچوو ئەو کات حوکمە شەرعییەکە دەگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی خۆی.

ئەمەیش پێچەوانەی ڕێسای پێشووترە کە دەڵێت: **(ماجاز لعذر بطل بزواله)**. هەر شتێك بۆ پاساوێك ڕێگەی پێدرا بەنەمانی پاساوەکە ڕێگەی لێ دەگیرێتەوە، کە کار لەسەر ڕێگەپێدانی حەرامەکان دەکات لەکاتی پێویست و ناچاریدا، بەڵام هەمان مەبەستی ئەوی هەیە لە ئاسانکاری کردن بۆ مرۆڤەکان، ئەویان کار لەسەر لابردنی ئەرك و ئەمیان لەسەر هەڵگرتنی حەرامەکان لەکاتی پێویست و ناچاریدا بەپێی پێودانگە شەرعییەکان.

**سەرچاوە:** ڕێساکە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾. (سورة البقرة: ٢٢٢). واتە: دەربارەی حوکمی سەرجێی کردن لەگەڵ ئافرەت لەسوڕی مانگانەدا لێت دەپرسن، بڵێ: سەرجێی کردن لەگەڵیان لەو ماوەیەدا زیان بەخشە بۆیە تا پاك نەبنەوە سەرجێییان لەگەڵ مەکەن، کەی پاکبوونەوە و خۆیان پاك کردەوە بەو شێوەیەی خوای گەورە مۆڵەتی داوە بچنە لایان. کەواتە حوکمی سەرجێی کردن لەگەڵ ئافرەت کە کارێکی ڕێگە پێدراوە لەسوڕی مانگانەدا و بەرەچاوکردنی باری دەروونی و تەندروستی ئافرەتەکە هەڵدەگیرێت تا کاتی پاکبوونەوەی و کەی پاك بۆوە ڕێگەپێدانەکە وەك خۆی لێ دێتەوە لێرەدا سووڕی مانگانە ڕێگرەکەیە.

٢- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ – يَعْنِي الثُّومَ – فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا}.(رواه البخاري و مسلم). واتە: هەرکەسێك لەم ڕووەکەی خوارد – مەبەستی سیر بوو- با نزیکی مزگەوت نەکەوێت و لە هەندێك ڕیوایەتی فەرموودەکەدا هاتوە: نوێژمان لەگەڵ نەکات. کەواتە هەرچەندە هاتن بۆ مزگەوت کارێکی فەرمان پێ کراوە بەڵام خواردنی سیر دەبێتە ڕێگر و کەی بۆنەکەی نەما ئەو کات ڕێگرییەکە نامێنێت.

**نموونە:**

١- هەموو ئەو پەرستشانەی کە فەرمان پێکراون و بەهۆی سوڕی مانگانەوە لەسەر ئافرەت هەڵدەگیرێن وەك نوێژو ڕۆژو، بە نەمانی سوڕی مانگانەکە حوکمەکانیان وەك خۆی لێ دێتەوە وئافرەت دەبێت پێیانەوە پابەند بێت.

٢- هاوسەرگیری کارێکی خوازراو و ڕێگە پێدراوە بەڵام بۆ کەسێك ئیحرامی لەبەردا بێت دا بە حەج یان بە عەمرە دروست نییە و ڕێگەپێدراو نییە و هەر کات کەسەکە ئیحرامی شکاند حوکمی هاوسەرگیرییەکە وەك خۆی لێ دێتەوە و ڕێگەپێدراو دەبێتەوە.

٣- هەر ئافرەتێك بەهۆکارێکی کاتی حەرام بێت پیاو هاوسەرگیری لەگەڵ بکات وەك خوشکی خێزان یان هاوسەری کەسێکی تر یان بێ باوەڕی، بەنەمانی ئەو هۆکارە حوکمی حەرامییەکە لادەچێت و دروستە پیاو هاوسەرگیری لەگەڵ بکات.

٤- ئەگەر هەر ئافرەتێك لاساری کرد و ئەرکەکانی ژیانی هاوسەرگیری جێبەجێ نەکرد، هاوسەرەکەی بۆی هەیە خەرجی بژێوی ژیانی دابین نەکات، هەرکات گەڕایەوە و ئەرکەکانی جێبەجێ کرد ئەو کات مافی خەرجی بۆ دەگەڕێتەوە.

٥- کەسێکی منداڵ یان مێرد منداڵ کە ڕێگە نادەین هەندێك هەڵسوکەوتی یاسایی بکات، کەی پێگەیشت هەموو ئەو ڕێگرییانەی لەسەر لادەچێت و مافی ئەوەی پێ دەدرێت هەموو هەڵسوکەوتێکی یاسایی بکات.

٦- کەسێك ڕاسپاردە (وصية) ی کرد ئەگەر مرد خانوەکەی بۆ خێزانە مەسیحییەکەی بێت سپاردەکەی دروستە؛ چونکە خێزانە مەسیحییەکەی میراتگر نییە، بەڵام ئەگەر بەر لەمردنی هاوسەرەکەی موسوڵمان بوو، ئەو کات سپاردەکەی دروست نییە و هەڵدەوەشێتەوە؛ چونکە موسوڵمانبوونەکەی دەیکاتە میراتگر و میراتگریش سپاردە نایگرێتەوە.

## ڕێسای یازده

## الحاجة العامة تنزل منزلة الضرورة الخاصة

**واتە:** پێداویستی گشتی هەمان حوکمی ناچاری تایبەتی هەیە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایەیش دیسان لێکەوتەی ڕێسای (المشقة تجلب التيسير) ە. و بەشێکی ترە لەو ئاسانکارییانەی کە خوای گەورە لەئاستی کۆمەڵ و پێداویستییە گشتییەکانیدا بۆ بەندەکانی دەکات.

مەبەستی ڕێساکەیش ئەوەیە: کە چۆن خوای گەورە ئاسانکاری بۆ مرۆڤەکان دەکات و ڕێگە بەکردنی حەرامەکان دەدات لە سەر ئاستی تاك و لەکاتی ناچاریدا، بەهەمان شێوە ئاسانکارییان بۆ دەکات لەسەر ئاستی کۆمەڵ و لەکاتی پێداویستییدا ئەگەر چی پێویستییەکان نەشگەنە حاڵەتی ناچاری.

هەرچەندە ڕێساکە زۆر ڕوون و ڕێکە و بەم شێوەیەیە کە باسمان کرد؛ بەڵام هەندێك کەس بەهەڵە دایدەنێن و لێی تێ دەگەن، بۆ نموونە هەندێك کەس بە ڕەهایی دەڵێن: (الحاجة تنزل منزلة الضرورة). واتە: هەموو پێداویستییەك حوکمی ناچاری هەیە. یان دەڵێن: (الحاجة عامة كانت أو خاصة تنزل منزلة الضرورة). واتە: پێداویستی گشتیی بێت یان تایبەت هەمان حوکمی حاڵەتی ناچاری هەیە، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە چۆن بۆ حاڵەتی ناچاری ڕێگە بەکردنی حەرامەکان دەدرێت، بەهەمان شێوە بۆ حاڵەتی پێداویستیش ڕێگە بەکردنی حەرامەکان دەدرێت، ئەمەیش هەڵەیەکی ڕوونە و لەکەسی زانا ناوەشێتەوە و بەم پێیە بێت هیچ جیاوازییەك لە نێوان حاڵەتی پێداویستی و ناچاریدا نییە، هەر وەك چۆن هیچ جیاوازییەکیش لە نێوان پێداویستی تاك و کۆمەڵدا نییە، ئەم جۆرە تێگەیشتنەیش دوورە لە ڕۆحی شەرع و بنەما زانستییەکانییەوە؛ چونکە حەرامەکان لەسەر ئاستی تاك تەنها لە کاتی ناچاریدا ڕێگەیان پێ دەدرێت نەك بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکان؛ بەڵام پێداویستییەکان ئەگەر گشتی بوون و زۆر دووبارە دەبوونەوە و هەموو خەڵکی بەهۆیەوە تووشی نارەحەتی دەبوون ئەو کات شەرع ئاسانکاری زیاتریان بۆ دەکات و وەك حاڵەتی ناچاری مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.

بەشێوەیەکی گاتیش ئەو ئاستەنگ و ناڕەحەتییانەی دێنە ڕێگەی مرۆڤ بەسەر چەند پلەیەکدا دابەش دەبن کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئەو ناڕەحەتی و ئاستەنگانەی کە لەتوانای مرۆڤەکان بەدەرن و شەرع هەرگیز داوایان ناکات.

٢- ئەو ناڕەحەتی و ئاستەنگانەی کە زۆر بە زەحمەت جێبەجێ دەبن و مەترسی لە سەر ژیان و تەندروستی مرۆڤەکان دروست دەکەن، ئەمەیش دیسان شەرع داوای ناکات و لەگەڵی نییە.

٣- ئەو ناڕەحەتی و ئاستەنگانەی کە ئاسایین و مرۆڤ دەتوانێت زاڵ بێت بەسەریاندا و هیچ مەترسییەك بۆ سەر ژیان و تەندروستییان دروست ناکات، ئەمەیان شەرع داوای دەکات و دەیکاتە سەنگی مەحەکی تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان و پێویستە پێوەی پابەند بن و هیچ پاداشتێکیش بێ ماندووبوون نابێت.

٤- ئەو ناڕەحەتی و ئاستەنگانەی کە ئاسایین و دەکرێت مرۆڤەکان پێیانەوە پابەند بن، بەڵام بەهۆی گشتگیری و زۆری دووبارەبوونەوەیانەوە ئاستەنگ و ناڕەحەتییەکەیان زۆر دەبێت، ئەم جۆرەیە کە ئێمە لە ئێستادا قسەی لەسەر دەکەین و شەرع ئاسانکاری تێدا دەکات و وەك ناچاری سەیری دەکات.

بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە بابەتەکە ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر بابەتی پێداویستییە گشتییەکان دەدەین.

**جیاوازیی:** بۆ جیاکردنەوەی حاڵەتی ناچاری لە حاڵەتی پێداویستی ڕەچاوی ئەم خاڵانە دەکرێت:

١- ناچاری بەشتێك دەگوترێت کە نەبوونی مەترسی لەسەر ژیانی مرۆڤ دروست دەکات، بەڵام پێداویستی ڕاستە کارئاسانی بۆ مرۆڤەکان دەکات؛ بەڵام نەبوونی مەترسی لەسەر ژیانیان دروست ناکات، وەك برسێتییەکەی ئاسایی کە هەرچەند کەسەکە پێی ناڕەحەتە بەڵام دەکرێت بەرگەی بگرێت و مەترسی لەسەر ژیانی دروست ناکات.

٢- ناچاری حاڵەتێکی کاتییە و دەڕوات و پەیوەستە بەکەسێکی دیاری کراوەوە، بەڵام پێداویستیی حاڵەتێکی بەردەوام و گشتییە.

٣- کاریگەری ناچاری لەسەر گۆڕینی حوکمە شەرعییەکان زۆر لە کاریگەری پێداویستی لەسەر گۆڕینیان زیاترە، هەر بۆیە حاڵەتی ناچاری زۆرێك لە حەرامەکان حەڵاڵ دەکات؛ بەڵام پێاویستی هیچ حەرامێك حەڵاڵ ناکات.

٤- هەمیشە پێداویستییەکانی مرۆڤ لە حاڵەتی ناچارییەکانی زیاتر و گشتگیر ترن.

٥- لە حاڵەتی ناچاریدا مەرجە ناچاریی و مەترسییەکە لە ئێستادا بوونیان هەبێت تا شەرع ئاسانکاری بۆ بکات؛ بەڵام بۆ حاڵەتی پێداویستی مەرج نییە لە ئێستادا بوونی هەبێت تا ئاسانکاری بۆ بکرێت، بەڵکو دەکرێت پێشبینی کراو بێت.

٦- بۆ حاڵەتی ناچاریی مرۆڤ بۆی هەیە ئەوەندە سوود لە ئاسانکارییە شەرعییەکان وەربگرێت تا حاڵەتی ناچاریی و مەترسییەکەی لادەچێت، بەڵآم بۆ حاڵەتی پێداویستی مرۆڤ هەر کات ویستی و پێویستی بوو دەتوانێت بەکاری بهێنێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی سوننەت و ڕێسای شەرعیی ترەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- **(بيع العرايا):** ئاڵوگۆڕکردنی خورمای وشك بەخورمای تەڕ: کاتی خۆی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆربەیان هەژارو دەست کورت بوون، کاتێك خورما پێ دەگەشت ئەمان پارەیان پێ نەبوو خورمای تەڕو تازە بکڕن و هەر ئەو خورما وشکەیان هەبوو کە ساڵی پێشتر بەزەکات وەریان گرتبوو؛ بۆیە هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای حاڵی خۆیان کرد کە منداڵەکانمان ساڵێکە خورمای وشك دەخۆن و ئێستا حەزیان لەخورمای تازەیە و ئێمەیش پارەمان پێ نییە خورمای تازەیان بۆ بکڕین، جا ڕێگەمان پێ دەدەیت خورما وشکەکە بگۆڕینەوە بە خورما تەڕ و تازەکە، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی پێدان.

هەرچەندە ئەم مامەڵەیە لەگەڵ بنەما شەرعییەکان یەك ناکاتەوە و سوو دروست دەکات؛ چونکە فرۆشتنی خورمای وشکە بە خورمای تەڕ بە زیاد و کەم، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ لە پێناو پڕکردنەی پێداویستی هەژاراندا ڕێگەی پێدا و پێی فەرموون: با خەڵکی شارەزا کە پێیان دەگوترا **(الخارصون)** هەڵسەنگاندن بۆ خورما تەڕەکە بکەن ئەگەر وشك بێتەوە چەند کیلۆ یان چەند تەنەکە خورمای وشکی لێ دەردەچێت، ئەو کات بەوەندە خورمای وشك بیگۆڕنەوە. ئەم کارئاسانییەی پێغەمبەر ﷺ کردی تەنها لە بەرژەوەندی

هەژارەکان نەبوو بەڵکو لە بەرژەوەندی دەوڵەمەندکان و خاوەن باخە خورماکانیش بوو؛ چونکە ئەوانیش کە خورما پێ دەگەشت نەیاندەتوانی یەکسەر هەموو خورماکانیان بفرۆشن و ساغ بکەنەوە و نەیشیان دەتوانی خورماکە بەتەڕی هەڵبگرن چونکە تێك دەچوو؛ بۆیە ناچار وشکی بکەنەوە، ئەوەیش بەشی خۆی تێچوو و ئەرکی هەبوو، بەڵام بەم شێوازەی پێغەمبەری خودا ﷺ فێری کردن، هەم پێداویستییەکانی هەژاران پڕ بوویەوە هەم ئەرکی سەر شانی دەوڵەمەندەکانیش سووك بوو.

ئێستا ئەگەر سەرنج بدەین ئەم ئاسانکارییەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەو هەژارانەی کرد بۆ حاڵەتی ناچاری نەبوو؛ چونکە ئەگەر هەژارەکان خورمای تەڕ و تازەیان نەخواردایە نە دەمردن نە ژیانیشیان دەکەوتە مەترسییەوە، بەڵام بۆ پێویستی بوو، وە بۆ دڵدانەوەی هەژارەکان و خانەوادەکانیان بوو کە ئەوانیش وەك دەوڵەمەندەکان بۆ ماوەیەك خواردنی تازە و بەرهەمی ئەمساڵ بخۆن. وە بەم شێوازی مامەڵە و ئاڵوگۆڕە لەشەرعدا دەگوترێت (بيع العرايا).

٢- (بيع السلم) کڕین و فرۆشتن بە سەلەم، کە بریتییە لە فرۆشتنی شتێکی دیاریکراو و زانراو کە لە ئێستادا بوونی نییە بۆ ماوەیەك کە دڵنیایین لەو کاتەدا بوونی دەبێت و بەردەست دەبێت.

هەرچەندە ئەم مامەڵەیەیش بە پێی بنەما شەرعییەکان ڕێگەپێنەدراوە؛ چونکە تۆ شتێك دەفرۆشیت کە لەئێستادا بوونی نییە؛ بەڵام لەبەر بەرژەوەندی گشتی بەتایبەتی خەڵکانی هەژار ڕێگەپێدراوە.

بۆ نموونە: جوتیارێك زەویەکی زۆری بەدەستەوەیە، بەڵام پارەی جوت و تۆ و کێڵان و بژاری نییە، دەڕواتە لای کەسێکی دەوڵەمەند و لەبری ئەوەی پارەی بەقەرز یان بەسوو لێ وەربگرێت، لەگەڵی ڕێك دەکەوێت کە بڕێك گەنمی پێ بفرۆشێت بۆ مانگی شەش کاتێك گەنم پێ دەگات بەنرخێك لە ئێستای بازاڕ هەرزانتر، بەم شێوەیەیش هەم جوتیارەکە قازانج دەکات کە لەم سەرەوە دەستمایەی دەست دەکەوێت بۆ وەگەڕخستنی زەویەکەی لەو سەریشەوە فرۆشتنی بەروبوومەکەی مسۆگەر کردوە و دڵنیایە بەدەستییەوە دانامێنێت، هەم

کەسی خاون دەستمایەش قازانج دەکات بەوەی گەنمی کڕیوە بەنرخی بازاڕ کەمتر و پاش چەند مانگێك گەنمەکەی ڕادەست دەکرێت.

یان بۆ نموونە لە ئێستادا لایەنێکی وەکو حکومەت یان هەر کارگە یان کۆمپانیایەك پێویستی بەپارە ودەستمایە دەبێت، بۆ بەگەڕ خستنی کارگە وپرۆژەکانی، یان دەزگا وەبەرهێنەرەکانی، لەبری ئەوەی پارە بەسوو وەربگرێت، دەتوانێت بەشێك لەبەرهەمەکانی وەکو نەوت یان غاز یان هەر بەهەمێکی تری پێشوەخت بەپارەیەکی هەرزانتر لەبازاڕ بفرۆشێت، وپاش ماوەیەکی تر ڕادەستی لایەنی کڕیاری بکات، بەمەیش ئەم دەتوانێت سوود لەوپارانە وەربگرێت و پرۆژە وبەرهەمەکانی خۆی پێ بەگەڕ بخات وزیاد بکات و خاوەنی دەستمایەیش سوود لەهەرزانی نرخەکان دەبینێت. وبەم شێوەیەیش هەردوولا قازانج دەکەن.

ئەم مامەڵەیە جگە لە (بيع السلم) (بيع المحاويج) یشی پێ دەگوترێت واتە: فرۆشتنی خەڵکانی خاوەن پێداویستی.

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەربارەی ئەم مامەڵەیە دەڵێت: (قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَهُمْ يُسْلِفُونَ بِالتَّمْرِ السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ، فَقَالَ: {مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ، فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ}...). (رواه البخاري و مسلم). واتە: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە، خەڵکی مەدینە بۆ ماوەی ساڵ ودووساڵ خورمایان دەکڕی، پێغەمبەری خودا ﷺ کە ئەوەی بینی فەرمووی: هەرکەس شتێکی کڕی کە ئێستا بوونی نیە، با شتێك بکڕێت کە پێوانە، وکێشانە، وکاتی ڕادەستکردنی دیار و زانراو بێت.

٣- (الإستصناع): بەکرددان، یان بۆ دروستکردن: بریتییە لە کڕین یان فرۆشتنی شتێکی دیاریکراو کە لە ئێستادا بوونی نییە بەڵام پاش ماوەیەك بەپێی ئەو مەرجانەی کە لە گرێبەستەکەدا هاتووە دروست دەکرێت.

بۆ نموونە: کەسێك دەڕواتە کۆمپانیای تۆیۆتا داوای دروستکردنی (٥٠) ئۆتۆمبیل دەکات بەو تایبەتمەندیانەی خۆی دیاری دەکات، و پاش شەش مانگی دیکە ئۆتۆمبێلەکان ئامادە دەکرێن و ڕادەست دەکرێن.

ئەم مامەڵەیەیش بە پێی بنەما شەرعییەکان دروست نییە؛ چونکە مامەڵە کردنە بەشتێکەوە کە لە ئێستادا بوونی نییە، بەڵام شەرع لەبەر بەرژەوەندی گشتی ڕێگەی پێداوە؛ چونکە ئەگەر کۆمپانیا و خاوەن پیشەکان ناچار بکەین بەوەی دەبێت شتەکانیان ئامادە بکەن ئەوجا بیفرۆشن ئەوە زەحمەت و نارەحەتی بۆ خەڵکی دروست دەکات و لەوانەیە پاش ماوەیەك هەموو کۆمپانیاکان توشی ئیفلیجی بکات؛ چونکە سروشتی خەڵك و ئاو هەواو ناوچەکان وەك یەك نین و هەر کەسەو و بەپێی گونجانی خۆی داوای کاڵا دەکات بۆیە مەرج نییە ئەوەی کۆمپانیا دەیکات بەدڵی خەڵك بێت؛ بۆیە شەرع لەبەر بەرژەوەندی گشتی ڕێگەی بەم جۆرە مامەڵەیەیش داوە.

هەموو ئەمانە و چەندین مامەڵەی تر هەن کە بەپێێ بنەما شەرعییەکان دروست نین و حاڵەتی ناچاریش نین بەڵام لە پێناو دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گشتیدا شەرع ڕێگەی پێداون.

٤- ڕێسای (المشقة تجلب التيسير). واتە: بارگرانی ئاسانکاری بەدوای خۆیدا دەهێنێت. پێداویستییە گشتییەکانیش ئەگەر کارئاسانییان بۆ نەکرێت بارگرانی بۆ خەڵکی دروست دەکەن.

مەرج و ڕێکارە شەرعییەکان: لە پێناو بەرگرتن بەهەر جۆرە خراپ تێگەیشتن یان کارپێکردنێکی ڕێساکە زانایان کۆمەڵێك ڕێکار و مەرجیان داناوە کە پێویستە لەکاتی کارپێکردنی ڕێساکەدا هەبن و ئەوانیش بریتین لە:

١- پێداویستییەکە بنەمایەکی شەرعی هەبێت و لەگەڵ ئامانج و مەبەستە شەرعییەکاندا یەك بکاتەوە و پێچەوانەی هیچ دەق یان مەبەست یان بەرژەوەندییەکی شەرعی نەبێت.

٢- پێداویستییەکە نارەحەتی زۆر بۆ خەڵکی دروست بکات، وەك ئەو نموونانەی پێشتر باسمان کرد؛ بەڵام ئەگەر نارەحەتییەکە زۆر قورس نەبوو ئەو کات ڕێگەی پێ نادرێت؛ چونکە وەك پێشتریش گوتمان هیچ داخوازێکی شەرعی بێ نارەحەتی نییە.

٣- پێداویستییەکە لە ئێستادا بوونی هەبێت یان پێشبینی کراو بێت؛ نەك تەنها گومان و قسە بێت.

٤- پێداویستییەكە بە شێوەیەكی گشتی لەبەرژەوەندی هەموو خەڵكی بێت بەتایبەتی چینی هەژار و كەم دەرامەت. نەك خەڵكی دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتوو.

٥- هیچ بژاردەیەكی تری ڕێگەپێدراو لەبەردەستدا نەبێت بۆ دابینكردنی پێداویستییەكە جگە لە ئاسانكاری لە حوكمە شەرعییەكاندا نەبێت.

٦- زیادەڕەوی لە ئاسانكارییە شەرعییەكاندا نەكرێت و تەنها بەپێی پێویست كاری پێ بكرێت و پەنای پێ ببرێت.

**نموونە:**

١- كۆكردنەوەی نوێژەكان لەكاتی باران و سەرما و ناڕەحەتیدا، لە پێناو پاراستنی سەلامەتی و تەندروستی خەڵكیدا.

٢- ڕێگەدان بە نەكردنی نوێژی بەكۆمەڵ لەسەر ئاستی تاك یان كۆمەڵ لە كاتی بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشیدا، یان بوونی ترسی دوژمندا، یان خواردنی شتی بێزاركەردا لە نموونەی سیر و پیاز.

٣- ڕێگەدان بە حەمامە گشتییەكان بەكرێ سەرەڕای ئەوەی وردەكارییەكانی گرێبەستەكە نادیار و جیاوازە،

بۆ نموونە كەسێك دەڕواتە ژورەوە (١٠) خولەكی پێ دەچێت و خۆی فێنك دەكاتەوە و دێتە دەرەوە، هەیشە یەك كاتژمێری پێ دەچێت و لەوانەیە بەرمیلێك ئاو كاربكات، هەردووكیشیان سەرەنجام یەك پارە دەدەن. كاری سەرتاشخانە و پاسەكانی خەت وگەراجەكانیش هەمان گرفتیان هەیە و وردەكارییەكانی كارەكان جیاواز و نادیارن ونرخەكانیان وەك یەكە و شەرع لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا ڕێگەیان پێ دەدات.

٤- گرێبەستی **(جعالة)** كە بریتییە لە پێدانی خەڵاتێك لەبەرامبەر كردنی كارێكدا كە وردەكارییەكانی نادیارە و ڕوون نییە. بۆ نموونە: كەسێك سەیارەكەی دزراوە یان مانگاكەی ون بووە، دەڵێت: هەركەس بیدۆزێتەوە ئەوەندە خەڵاتی دەدەمێ، ئێستا ئێمە نازانین كەی دەیدۆزێتەوە و چۆن دەیدۆزێتەوە و چەندی پێ دەچێت و چی خەرج دەكات و سەرەنجام دەیدۆزێتەوە یان نا؛ بەڵام سەرەڕای ئەوانە هەمووی گرێبەستەكە لەبەر بەرژەوەندی گشتی ڕێگە پێدراوە.

٥- گرێبەستی (حوالة) کە لە بنەڕەتدا بریتییە لە گواستنەوەی قەرزێك لە ئەستۆی کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، ئەمەیش لەسەر هەمان شێوازی فرۆشتنەوەی قەرزە بەکەسێکی تر کە لەشەرعدا ڕێگە پێنەدراوە، بەڵام حەواڵە لەبەر بەرژەوەندی گشتی خاوەن قەرز و قەرزدارەکان ڕێگە پێدراوە.

تێبینی: لەکۆتاییدا هەندێك قسە لەسەر دوو ڕێسای پەیوەست بەم ڕێسایە دەکەین کە بریتین لە:

١- ڕێسای (لا واجب مع العجز). واتە: هیچ ئەرکێك لەکاتی نەتوانیندا بوونی نییە.

ئەم ڕێسایە بۆ ئەرکە شەرعییەکان و مافەکانی خوای گەورەیە و بە هیچ شێوەیەك ماف و قەرزی خەڵکی ناگرێتەوە و کەسەکە بتوانێت یان نا دەبێت مافی خەڵکی بگێڕێتەوە و بەنەتوانین لەسەری لاناچێت.

٢- ڕێسای (القادر بقدرة الغير ليس بعاجز). واتە: کەسێك بەهاوکاری کەسێکی تر بتوانێت ئەرکە شەرعییەکان جێبەجێ بکات بە نا توانا ئەژمار ناکرێت و پێویستە جێبەجێیان بکات.

بۆ نموونە: کەسێك خۆی ناتوانێت دەستنوێژ بگرێت؛ بەڵام ئەگەر کەسێك هاوکاری بکات دەتوانێت، حوکمی دەستنوێژ گرتن لەسەر ئەو کەسە لاناچێت ودەبێت هاوکاری خەڵکانی چواردەوری قبوڵ بکات و دەستنوێژ بگرێت.

یان کەسێك پارەی حەجی نییە و کوڕێك یان برایەکی دەوڵەمەندی هەیە، دەڵێت: بڕۆ بۆ حەج من پارەکەیت بۆ دەدەم، ئەگەر ئەم کەسە نەچێت و پاشان بمرێت، قەرزداری حەج بووە و دەبێت پاش مردنی بۆی بکرێت.

یان کەسێکی نابینا ئەگەر کەسێك هەبێت دەستی بگرێت و بیهێنێت بۆ نوێژی جومعە و جەماعەت ئەو کات بە نەتوانا لەقەڵەم نادرێت، یان کەسێك کەفارەتێك لەسەری واجب بووە و خۆی نییەتی بیدات، بەڵام کەسێکی تر ئامادەیە پارەکەی بۆ بدات، پێویستە قبوڵی بکات و ئەگەر نەیکرد قەرزدار دەبێت ودەبێت خۆی بیدات.

## ڕێسای دوازده

## لا ضرر و لا ضرار

**واته:** هیچ كەسێك بۆی نییە زیان لە كەسێكی تر بدات و زیانیش بە زیان چارەسەر نابێت.

كەواتە دەقی ڕێساكە لە دوو تەوەر پێك دێت:

تەوەری یەكەم: {لاَ ضَرَرَ}. هیچ كەس بۆی نییە زیان بگەیەنێت.

تەوەری دووەم: {وَلاَ ضِرَارَ}. كە لەسەر شێوازی موفاعەلە و هاوبەشی كردنە و واتا: (لاتقابل الضرر بالضرر). واتە: زیان بە زیان چارەسەر مەكە، كەسێك زیانی پێگەیاندبیت، زیانی لێ مەدەرەوە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە دەقی فەرموودەیەكی پێغەمبەرە ﷺ و یەكێكی ترە لەو پێنج ڕێسایەی كە فیقهی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە و هەندێك لەزانایان وەك نیوەی فیقە پۆلێنی دەكەن؛ چونكە كۆی بابەتە فیقهییەكان و مەبەستەكانی شەریعەتی ئیسلامی لە دوو تەوەردا كۆ دەبنەوە:

١- بەدەستهێنان و بەرجەستەكردنی بەرژەوەندییەكانی مرۆڤ كە پێی دەگوترێت (جلب المصالح).

٢- بنبڕكردن و لابردنی خراپە و زیانەكان لە ڕێگەیاندا كە پێی دەگوترێت (درء المفاسد).

هەر وەك خوای گەورە كاتێك باس لە ئامانجی ناردنی پێغەمبەر ﷺ دەكات لەو دوو مەبەستەدا كۆی دەكاتەوە و دەفەرموێت: ﴿يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾. (سورة الأعراف: ١٥٧). واتە: فەرمانیان پێ دەكات بەچاكە و ڕێگریان لێ دەكات لە خراپە و شتە باش و سوود بەخشەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات و شتە خراپ و زیانبەخشەكانیان لێ قەدەغە دەكات.

ئەمەیش سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە كە كۆی شەریعەتی ئیسلامی و سەرجەم بابەتە فیقهییەكانی لە بەرژەوەندی مرۆڤەكان دانراون تا تووشی هیچ زەرەر و زیانێك نەبن.

ئەم فەرمووده و ڕێسایەش پێمان دەڵێن کە هەر کارێك ببێتە مایەی زیان گەیاندن بە خود یان بەخەڵکی یان بە ئاژەڵ و زیندەوەرەکان یان بە ژینگە و سروشت یان بەهەر بوارێکی تری ژیان یاساغە و ڕێگەپێنەدراوە، خۆ ئەگەر کەسێکیش کارێکی لەو شێوەیەی کرد ئەوە نابێت بەرامبەرەکانی وەك ئەو وەڵامی بدەنەوە بەڵکو دەبێت ڕێگە چارەی تر بگرنە بەر بۆ بنبڕکردنی زیانەکان و تەمبێ کردنی زیان بەخشەکان و قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتوان.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەربارەی شێوازی دابەشکردنی میرات و جێبەجێ کردنی وەسییەتی مردووەکان دەفەرموێت: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضارٍّ﴾. (سورة النساء: ١١).
واتە: دابەشکردنی میراتەکەی پاش جێبەجێکردنی وەسیەتەکانی مردووەکە و دانەوەی قەرزەکانی دەبێت، بەمەرجێك مەبەستی وەسییەتەکی زیان گەیاندن نەبێت بە میراتگرەکانی، وەك ئەوەی کەسێك بڵێت کەمردم هەموو ماڵەکەم بۆ بکەن بە خێر، یان میرات بەخێزانم یان یەکێك لەمنداڵەکان یان میراتگرەکان مەدەن، یان با بەشی ئەو کوڕەم لەو کوڕەم یان ئەو خێزانەم لەوی تریان زیاتر بێت، یان وەسییەتەکەی بۆ کاری حەرام بێت، وەك دروستکردنی باڕ و شوێنی خواردنەوە و قومارخانە و کڵێسا و ڕێکخراو یان پارتێك یان دەزگایەکەی ڕاگەیاندن کە دژایەتی ئیسلام و موسوڵمانان و بەها ئایینی و ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگەی موسوڵمانان بکات، هیچ کام لەم جۆرە وەسییەتانە دروست نین و جێبەجێ ناکرێن؛ چونکە مەبەستی زیان گەیاندنی تێدایە و شەرعیش ڕێگە بە زیان گەیاندن نادات.

٢- دەربارەی مامەڵەکردنی پیاوان لەگەڵ خێزانەکانیان و شێوازی چارەسەرکرنی کێشەکانی نێوانیان دەفەرموێت: ﴿فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لَّتَعْتَدُواْ﴾. (البقرة: ٢٣١). واتە: ئەگەر بڕیارتان دا لە ژیانی هاوسەری لەگەڵیان بمێننەوە و بەردەوام بن ئەوا باش بن لەگەڵیان و ڕێزیان لێ بگرن، خۆ ئەگەریش بڕیارتان دا لێیان جیا ببنەوە ئەوە دیسان باش بن لەگەڵیان و ستەمیان لێ مەکەن و مافەکانی

خۆیان بە باشی پێ بدەن. و بۆ ئەوە مەیانهێڵنەوە ستەمیان لێ بکەن و زیانیان پێ بگەیەنن.

ئەم ئایەتە لەسەر نەریتێکی کۆنی سەردەمی نەفامی عەرەب هاتە خوارەوە کە ئەو کات ژمارەی تەڵاقەکانی پیاو لەپرۆسەی هاوسەرگیرییدا ڕەها بوون و سنووردار نەبوون، کاتێك پیاوێك ژنەکەی تەڵاق دەدا دەری دەکرد و خەرجی نەدەکێشا و نەیدەهێنایەوە لای خۆی، تا خەریك بوو ماوەی عیددەی تەواو دەبوو، ئەو کات تەڵاقێکی تری دەخست و ماوەی عیددەی بۆ تازە دەکردەوە، کە خەریك بوو ئەو ماوەیەش تەواو دەبوو، دیسان تەڵاقێکی تری دەخست و بەم شێوەیە ئافرەتەکە لە چاوەڕوانیدا دەمایەوە، نە ئەوەبوو بیهێنێتەوە و مافەکانی خۆی پێ بدات و بەباشی مامەڵەی لەگەڵ بکات، نەئەوەش بوو دەستی لێ بەربدات تا شوو بەکەسێکی تر بکاتەوە، بەم شێوەیەش ژیانی ئافرەتەکە بەهەڵپەسێردراوی دەمایەوە.

٣- دەربارەی مافی باوك و دایك لە بینین و پەروەردە و بەخێوکردنی منداڵدا دەفەرموێت: ﴿لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ﴾. (البقرة: ٢٣٣). واتە نابێت هیچ کاتێك منداڵ وەك چەك و کارتی فشار بەرامبەر بە دایکی یان باوکی بەکاربهێنرێت و منداڵەکان ببنە مایەی خەفەت و زیان بۆ دایك و باوکیان؛ چونکە زۆر کات باوکان و دایکان لەکاتی کێشەدا منداڵەکان وەکو کارتی فشار دژ بەیەکتر بەکار دەهێنن و بەو هۆیەوە ئازاری یەکتر دەدەن، خوای گەورە ڕێنموویيان دەکات کە هەرگیز بیر لە کاری وا نەکەنەوە.

٤- دەربارەی بابەتی شایەتیدان و نێوەندگیریی لە نێوان خەڵکیدا دەفەرموێت: ﴿وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ﴾. (البقرة: ٢٨٢). واتە: نابێت زیان بە هیچ شاهیدێك یان نێوەندگیرێك کە ڕێکەوتنی نێوان دووکەس دەنووسێتەوە بگەیەنرێت، بەوەی داوایان لێبکرێت شایەتی ناحەق بدەن، یان دەستکاری نارەوای نووسراوەکانیان بکەن، یان سەرەڕای چاکە و پیاوەتییان تۆمەتبار بکرێن. ئەوانە هەمووی کاری نارەوان و دروست نین.

٥- ئەم فەرموودەیەی کە ئێستا لەسەرو بەندی باسکردنیداین: {لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ}. (إبن ماجة، السنن، وصححه الألباني).

٦- كۆدەنگی زانایان: زانایان كۆ دەنگن لەسەر كاركردن بەم ڕێسایە و حەرامكردنی هەموو جۆرە زەرەر و زیانێك هەر كەسێك لەهەر شتێكی بدات، زوحەیلی لەو بارەیەوە دەڵێت: (والضرر لا يحل بإجماع). (وهبة الزحيلي، التفسير المنير، ج٥، ٢٦٩). واتە: زانایان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەموو جۆرە زیان گەیاندنێك حەرامە و دروست نییە.

نموونە:

١- هەر كەسێك لە گەڕەكێكدا یان لە بازاڕێكدا خانویەك یان زەویەك یان دوكانێكی هەبێت، بۆی نییە بەشێوەیەك بەكاری بهێنێت كە زیان بە هاوسێكانی بگەیەنێت و ئارامییان تێك بدات.

٢- هەر جۆرە خواردن یان خواردنەوەیەك زیان بە تەندروستی مرۆڤ یان ژینگەكەی بگەیەنێت، دروستكردن و بازرگانی پێوەكردن و بەخشین و هەموو جۆرە مامەڵە پێوەكردنێكی حەرامە و دروست نییە.

٣- هەر ژن یان پیاوێك لەپرۆسەی هاوسەرگیریدا زیان بەبەرامبەرەكەی یان منداڵەكانی بگەیەنێت لە ڕوی ئایینی یان جەستەیی یان دارایی یان سۆزداری، بەرامبەرەكەی بۆی هەیە داوای جیابوونەوەی لەسەر تۆمار بكات و دادوەر لەیەكتریان جیا دەكاتەوە. مالیكییەكان لەم بابەتەدا زۆر توندن و پێش ڕێكخراوەكانی ژنان و جاڕنامەی گەردوونی مافەكانی مرۆڤ و دروست بونی بزوتنەوە فیمەنیستیەكان هەزارار ساڵ لەمەو بەر وتویانە: پیاو بۆ یەكجار بە خێزانەكەی بڵێت: (كچی سەگ). خێزانەكەی بۆی هەیە داوای جیابونەوەی لەسەر تۆمار بكات، ئیتر مەرج نییە دووبارەی بكاتەوە، چونكە ئەمە زیانێكی دەرونی و ئەدەبییە بۆ ئافرەتەكە. یان دەڵێن ئەگەر پیاو لەكاتی خەوتندا خوی گرتبێت بەوەی پشت بكاتە ژنەكەی بەبێ ئەوەی مەبەستی سزادان یان عاجز بوونیش بێت، بەڵكو تەنها خویەك بێت، خێزانەكەی بۆی هەیە بەو بیانووە داوای جیابونەوە بكات.

ئەمانە و سەدەها نموونەی تر هەن لەسەرجەم بوارە فیقهییەكاندا كە هەر لەسەر ئەم ڕێسایە دامەزراون و كاریان پێ دەكرێت و حوكمی شەرعییان لەسەر بونیاد دەنرێت.

## ڕێسای سیازده

## الضرر يزال

واتە: زیانەکان هەرچی و هەرچۆن و هەرچەند و لە هەر ڕوویەکەوە و لە هەر کەسێکەوە بن، لا دەبرێن و هەڵدەگیرێن.

گرنگی: ئەم ڕێسایە لێکەوتەی ڕێسای پێشوە {لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ}.و تەواوکاری ئەوە و مەبەستی بنبڕکردنی هەر گوفتار و ئاکار و هەڵوێستێکی مرۆڤەکانە کە زیان بەبەرژەوەندی بەرامبەرەکانیان بگەیەنێت و ئاسایشی ژیانیان تێك بدات؛ بۆیە بەپێی ڕێسای یەکەم هیچ کەس بۆی نییە زیان لە کەسێکی تر بدات و ئەگەریش زیانێك ڕوویدا، ئەوە زیان بەزیان چارەسەر نابێت، ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە شەرع ڕێگە بەبەردەوامی زیانەکان بدات؛ بەڵکو بەپێی ئەم ڕێسایە کار لەسەر لابردن و هەڵگرتن و قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکان دەکات، ئەمەیش ئەو پەڕی هاوسەنگی و دادوەرییە و باشترین ڕێگە چارەیە بۆ بەرگرتن لە هەر کار یان دیاردەیەکی خراپ و دزێو و زیان بەخش لە کۆمەڵگەدا.

سەرچاوە: ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەت و بەڵگەی ترەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ، وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾. (البقرة: ٢٢٦-٢٢٧). واتە: ئەو پیاوانەی سوێند لەسەر هاوژینەکانیان دەخۆن کە ئیتر ناچن بەلایاندا و کاری سەرجێییان لەگەڵ ناکەن، خێزانەکانیان تا چوار مانگ چاوەڕوانی دەکەن، دواتر ئەگەر لەسوێندەکانیان پاشگەز بوونەوە و چوونەوە لایان ئەوە دەبێت کەفارەتی سوێندەکەیان بدەن و خوای گەورەیش زاتێکی لێبوردە و بەبەزەییە، خۆ ئەگەریش بەردەوام بوون لەسەر سوێندەکەیان و ئامادە نەبوون بچنەوە لای خێزانەکانیان ئەوکات دادگا ئافرەتەکە لە هاوسەرەکەی جیا دەکاتەوە و هەموو مافەکانی خۆی پێ دەدات و خوای گەورەیش بیسەر و زانایە بە حاڵی بەندەکان.

ئەم ئایەتە بۆ بنبڕکردنی دیاردەیەکی سەردەمی نەفامی بوو، کە پیاوان سوێندیان لەسەر خێزانەکانیان دەخوارد کە تا ماون نەچن بەلایاندا و ئیتر بەو شێوەیە خێزانەکانیان دەهێشتەوە، نە لێیان جیا دەبوونەوە تا شوبکەنەوە، نەهیچ مافێکی ژیانی هاوسەریشیان پێ دەدان، کە ئیسلام هات خوای گەورە ئەم یاسایەی بۆ دانان کە هیچ پیاوێك بۆی نییە بە بێ پاساوێکی شەرعی وەك نەخۆشی یان سەفەر تا چوار مانگ زیاتر نەچێت بەلای خێزانیدا و هەر کەس کاری لەو جۆرەی کرد، شەرع مافی ئەوە دەدات بە خێزانەکەی کە داوای جیابوونەی لێ بکات و لەگەڵی جیا بێتەوە. ئەمەیش بەشێکە لە ڕێسای (الضرر يزال). و خوای گەورە ئەو زیانە لەسەر ئافرەتەکە هەڵدەگرێت کە بەهۆی سوێندی پیاوەکەوە تووشی دەبێت و ڕێگە بە درێژەپێدانی نادات.

٢- پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: {مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ – يَعْنِي الثُّومَ – فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا}.(رواه البخاري و مسلم). واتە: هەرکەسێك لەم ڕووەکەی خوارد – مەبەستی سیر بوو- با نزیکی مزگەوت نەکەوێت و لە هەندێك ڕیوایەتی فەرموودەکەدا هاتوە: نوێژمان لەگەڵ نەکات؛ چونکە هەر شتێك کە خەڵکی ێزار دەکات، فریشتەکانی خوای گەورەیش بێزار دەکات.

هەر بۆیە هەر کەسێك سیر یان پیاز یان هەر بۆنێکی تری ناخۆش لە دەمی یان جلەکانی یان لەشی دەهات، یان نەخۆشیەکی هەبوو مەترسی بڵاو بوونەوەی هەبوو، وەك هەڵامەت یەن ئەو کۆرۆنایەی ئێستا بەربڵاوە و ترس و دڵەڕاوکێی لای خەڵکی دروست کردوە، با نزیکی مزگەوت نەکەوێت و خەڵکی بێزار نەکات، خۆ ئەگەر کەسەکە بەو حاڵەیشەوە هەر چوو بۆ مزگەوت، ئەو کات نوێژخوێنانی مزگەوت بۆیان هەیە ڕێگەی پێ نەدەن و بیکەنە دەرەوە.

٣- سەمورەی کوڕی جوندوب دەڵێت: (كَانَتْ لَهُ عَضُدٌ مِنْ نَخْلٍ فِي حَائِطِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، قَالَ: وَمَعَ الرَّجُلِ أَهْلُهُ، قَالَ: فَكَانَ سَمُرَةُ يَدْخُلُ إِلَى نَخْلِهِ فَيَتَأَذَّى بِهِ وَيَشُقُّ عَلَيْهِ، فَطَلَبَ إِلَيْهِ أَنْ يَبِيعَهُ فَأَبَى، فَطَلَبَ إِلَيْهِ أَنْ يُنَاقِلَهُ فَأَبَى، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَطَلَبَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، أَنْ يَبِيعَهُ فَأَبَى فَطَلَبَ إِلَيْهِ أَنْ يُنَاقِلَهُ فَأَبَى، قَالَ: {فَهِبْهُ لَهُ وَلَكَ كَذَا وَكَذَا} أَمْرًا رَغَّبَهُ فِيهِ فَأَبَى، فَقَالَ: {أَنْتَ مُضَارٌّ} فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْأَنْصَارِيِّ: {اذْهَبْ فَاقْلَعْ نَخْلَهُ}. (البيهقي، السنن

الکبری). واته: چەند بنە خورمایەکم هەبوو لە باخی کابرایەکی پشتیوانی خەڵکی مەدینەدا، ئەو پیاوە خاو و خێزانی لە باخەکەدابوون، هەر جارێك کە دەچووم باخەکە بۆ سەردانیکردن و خزمەتکردنی خورماکانم ئەو پیاوە پێی ناخۆشبوو وە لەسەر دڵی گرانبوو، خاوەن باخەکە پێی گوتم: ئەو چەند برە دارەم پێ بفرۆشە، ڕازی نەبووم، گوتی: ئەوانە بۆ من جێ بهێڵە من لە شوێنێکی تر حەقت بۆ دەکەمەوە و داری ترت دەدەمێ، هەر ڕازی نەبووم، پیاوەکە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای کرد، پێغەمبەریش ﷺ دیسان داوای لێکردم پێی بفرۆشم یان بیگۆڕمەوە لەگەڵی بەداری تر لە شوێنێکی تر، دیسان ڕازی نەبووم، پاشان پێی فەرمووم: باشە لەبەر خوای گەورە دەست لەو چەند دارە هەڵگرە و بیبەخشە بەو هاوسێیەت، خوای گەورە ئەوەندە و ئەوەندە پاداشتت دەداتەوە و شتی زۆر باشی فەرموو، هەر ڕازی نەبووم. دواتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ پیاوێکی زیان بەخشی و ئەوجا ڕووی کردە خاوەن باخەکە و پێی فەرموو: برۆ دارخورماکانی هەڵکەنە و فڕێیان بدەرە دەرەوە.

٤- دوو پیاو لەسەردەمی پێشەوا عومەردا دوو باخیان هەبوو بە تەنیشت یەکەوە، ئاوێك کە سەرچاوەی ئاوەدانی و سەوزی زەوییەکان بوو، بەناو باخی یەکێکیاندا دەڕۆشت بۆناو باخی ئەوی تریان، ئەوەی باخەکەی کەوتبووە لای سەرەوە گوتی: من نایەڵم ئاو بەناو باخی مندا بۆ تۆ بێت، دراوسێکەی ڕۆیشت لای پێشەوا عومەر سکاڵای کرد و گوتی ئاوی باخەکەی منی بڕیوە و ناهێڵێت ئاو بۆ باخەکەی من بێت، پێشەوا عومەر ناردی بەشوێنیدا و پێی گوت: با ئاوەکە وەك خۆی بڕاوت و لێگەڕێ ئەو پیاوە ئاوی باخەکەی خۆی بدات. گوتی: نایەڵم. گوتی: جۆگەی ئاوەکە چەند زیان بەزەویەکەی تۆ دەگەیەنێت ساڵانە ئەوەندە قەرەبووی لێ وەربگرە. گوتی: هەر نایەڵم. گوتی: جۆگەکە چەند لەزەویەکەت داگیر دەکات پێی دەڵێم ئەوەندە لە زەویەکەی خۆی بۆ تۆ جێ بهێڵێت. گوتی هەر نایەڵم. گوتی: زەویەکەی لەگەڵ بگۆڕەوە و با ئەو بچێتە لای سەرەوە و ئەو هیچ لاری نییە لەوەی ئاوەکە بەباخەکەی ئەودا بۆ تۆ بێت. گوتی: هەر نایەڵم. پێشەوا عومەر پێی فەرموو: دەی سوێند بەخوا ئەگەر بەسەر لاشەکەتدا بردبێتم ئەو ئاوە بۆ باخی ئەو پیاوە دەبەم.

**نموونە:**

**١- شەرع ڕێگە بە كوشتنی هەر ئاژەڵێك دەدات كە مەترسی بۆ سەر ژیانی مرۆڤ دروست بكات، یان زیان بەبەرژەوەندییەكانی بگەیەنێت و ئارامی تێك بدات، لە نموونەی: مار و دووپشك و زەردەواڵە و بەراز و گورگ و مشك و جرج، یان مێرولە و سیسرك و قالۆنچە لە ماڵدا ئەگەر بێزاركەربوون.**

**٢- ڕێگە گرتن لە هەر دیاردە و ئاكار و جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوەیەك كە خراپە و ئاشوب لەناو كۆمەڵگەدا بڵاو بكاتەوە**

**٣- نەشتەرگەری جوانكاری ئەگەر تەنها بەمەبەستی جوانكاری ئەنجام بدرێت دروست نییە، بەڵام ئەگەر بۆ چاكردنەوە یان لابردنی عەیبێك بێت، ئەو كات كێشەی نییە.**

**٤- ئەگەر بازرگانەكان یاخود خاوەن پیشە هەستیارەكانی وەكو پزیشكەكان و دەرمانخانەكان نرخی كاڵاكانیان لەسەر هاوڵاتیان زیاد كرد، دەسەڵات بۆی هەیە نرخ لەسەر شتەكان دابنێت لە پێناو بەرگرتن بەزیانی گشتی و پاراستنی بەرژەوەندی هاوڵاتیان.**

**٥- لە كاتی بوونی گرێبەستە ناچاركارەكاندا (عقود الإذعان) وەك گرێبەستەكانی بەكارهێنانی مۆبایل كەهاوڵاتی ناچارە ئەو خزمەتگوزارییە بەكاربهێنێت و واژۆ لەسەر گرێبەستەكەی دەكات بێ ئەوەی مافی ڕەخنەگرتن یان هەمواركردنەوەی بڕگەكانی هەبێت، دەسەڵآت بۆی هەیە لەو جۆرە حاڵەتانەدا بڕگەكەكانی گرێبەستەكە هەموار بكاتەوە لە پێناو ڕێگرتن لەهەر زیانێكی ئەو گرێبەستانە و پاراستنی بەرژەوەندی گشتیدا.**

**٦- لەكاتی بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشیدا كەرەنتین كردنی تاكە كەس یان بەكۆمەڵ ئاساییە و ڕێگەپێدراوە، ئەمەیش لەپێناو پاراستنی تەندروستی و ژیانی خەڵك و بەرگرتن بەزیانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەكان.**

**هەموو ئەمانە و سەدەها نموونەی تر هەن كە دەچنە خانەی لابردن و بەرگرتن بە زیانەكان و شەرع ڕێگەیان پێ دەدات.**

## ڕێسای چواردە

## الضرر لا يزال بمثله

واتە: زیان بە زیانێکی هاوشێوەی خۆی یان زیاتر لە خۆی لانابرێت.

گرنگی: ئەم ڕێسایەیش دیسانەوە لێکەوتەی ڕێسای {لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ}. ە و وەك ڕێکار و مەرجێك وایە بۆ جێبەجێکردنی ڕێساکە و جگە لەم ڕێسایە لەگەڵ زۆر ڕێسای شەرعی تری فیقهی مەقاصید و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگەگرتن لە خراپە یەك دەکاتەوە و هەموویان جەخت لەسەر یەك واتا دەکەنەوە کە لەکاتی هەوڵدان بۆ نەهێشتنی هەر خراپەیەك یان لابردنی هەر زیانێك، ناکرێت بەشتێك ڕێگری لێ بکرێت کە هاوشێوەی ئەو زیانەی ئێستا بێت یان خراپتربێت، لەم جۆرە حاڵەتانەدا ڕێگە بەبەردەوامی زیانی پێشوو دەدرێت تا ڕێگە چارەیەکی گونجاوتری بۆ دەدۆزینەوە بۆ بنەبڕکردنی. پێشەوا غەزالی دەربارەی ئەم جۆرە حاڵەتانە دەڵێت: (أهون الضررين يصير واجبا وطاعة بالإضافة إلى أعظمهما، كما يصير شرب الخمر واجبا في حق من غص بلقمة، وتناولُ طعام الغير واجبا على المضطر في المخمصة). (المستصفى ص١٦٧). واتە: لە نێوان دوو کاری خراپ و حەرامدا ئەوەیان کە زیانی کەمترە و حەرامییەکەی سوکترە دەبێتە واجب، هەر وەك چۆن خواردنەوەی عارەق لەسەر کەسێك دەبێتە واجب کە پارویەك لە قورگی گیرابێت و هیچی دەست نەکەوێت پێی قوت بدات جگە لە عارەق نەبێت، یان خواردنی ماڵی خەڵکی دەبێتە واجب بۆ کەسێك کە خەریك بێت لەبرسا بمرێت.

سەرچاوە: ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایان و بەڵگەی ئاوەزییەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿والْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ﴾. (البقرة: ٢١٧). واتە: زیانی کوفر و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لە کوشتن زیاتر و گەورەترە. بەم پێیەیش ئەگەر کەسێك کەوتە دوو ڕێیانی ئەوەی کە گیانی لەدەست بدات یان ئایینی، باشتر وایە گیانی لەدەست بدات و بە گیانی پارێزگاری لە ئایینی بکات نەك بە پێچەوانەوە.

٢- دەشتەكییەك هاتە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و لە مزگەوتەكەدا میزی كرد، هاوەڵان زۆریان پێ ناخۆش بوو، ویستیان لێی بدەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {دَعُوهُ، وَلاَ تُزْرِمُوهُ قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ، دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ، فَصَبَّهُ عَلَيْهِ}.(مسلم، صحيح مسلم). واتە: لێی گەڕێن پێی مەبڕن، كاتێك تەواو بوو: فەرمووی: سەتڵێك ئاوم بۆ بهێنن و كردی بەسەر شوێنی میزەكەدا.

لێرەدا زیانێك هەیە كە میزكردنە لەمزگەوتدا و پێویستی بە لابردنە و پێغەمبەری خوایش ﷺ زۆر ژیرانە چارەسەری دەكات و سەرەتا ڕێگە نادات میزەكە بە پیاوەكە ببڕن لەبەر چەند هۆكارێك لەوانە:

- كەسەكە دەشتەكییەو نەزانە و لەوانەیە ئەگەر لێی تورە بن یان لێی بدەن ڕق لە هاوەڵان و پێغەمبەر ﷺ و پەیامەكەیشی هەڵبگرێت.
- ئەو تازە میزەكەی كردوە و جێگەكەی پیس كردوە.
- بڕینی میزەكە بەوشێوەیە لەوانەیە لە ڕووی تەندروستییەوە زیانی پێ بگەیەنێت.
- ئەگەر بۆی بچن شپرزە دەبێت و لەوانەیە خۆیشی و ڕووبەرێكی زیاتری مزگەوتەكەیش پیس بكات.
- ئەگەر لێی بدەن لەوانەیە زیانێكی زیاتر لە كردنی میزەكە بەكەسەكە بگەیەنن.

بۆیە بەو شێوازە ژیرانەیە مامەڵە لەگەڵ پیاوەكەدا دەكات و كێشەكەیش چارەسەر دەكات.

٣- زانایان كۆدەنگن لەسەر كارپێكردنی ئەم ڕێسایە و لەسەر ئەوەی كە لۆژیكی و بەر ئاوەزی نییە ئێمە بڕۆین زیانێك بگۆڕین بە هێنانە ئاراوەی زیانێكی گەورەتر و زیاتر.

٤- ئێمە دەڵێین شتە حەرام و یاساغەكان لە حاڵەتی ناچاریدا دروستن، ئەگەر ناچاری نەما حەرامییەكەیان بۆ دەگەڕێتەوە، لێرەشدا حەرامێك هەیە و بەناچاری قبوڵی دەكەین، ئەگەر گۆڕییمان بە حەرامێكی لەخۆی خراپتر و گەورەتر، ئەوكات لەبری چاكە خراپەمان كردوە و شەرعیش بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەوەدا نییە.

**نموونە:**

١- پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو دوو ڕووەکانی شاری مەدینەی دەناسی و دەیزانی بەردەوام خەریکی ئاشوب و پشێوی نانەوە و ئاژاوەگێڕین، بەڵام هەرگیز ڕێگەی نەدەدا کە کەس بیانکوژێت و دەیفەرموو: خەڵك ڕوکەشی ئەمانە دەبینێت کە وەك بڕوادار و دڵسۆز خۆیان دەردەخەن و دواتر دەڵێن: موحەممەد ﷺ کەسێکی بێ وەفایە و هاوەڵانی خۆی دەکوژێت. لەبەر ئەوە زیانی مانەوەیانی بە کەمتر دەبینی وەك لە زیانی کوشتنیان؛ بۆیە هەرگیز ڕێگەی بە کوشتنیان نەدەدا.

٢- فەرمانی بە هاوەڵانی دەکرد گوێڕایەڵی ئەمیر و براگەورەکانیان بن ئەگەر ستەمێکی کەمیشیان لێ کردن؛ بەڵام بەمەرجێك موسوڵمان بن؛ چونکە دەیزانی زیانی ئەو گوێڕایەڵییە لە زیانی دووبەرەکی و پەرتەوازەیی و خوێن ڕشتن کەمترە.

٣- لە بابەتی فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگە گرتن لەخراپە ناکرێت ڕێگە لە خراپەیەك بگرین بەخراپەیەکی هاوشێوەی خۆی یان لەو خراپتر، بۆ نموونە ڕێگە نەدەین پزیشکێکی پیاو پشکنین بۆ ئافرەتێکی نەخۆش بکات و لەدەرەنجامی ئەو ڕێگرییە ئافرەتەکە بمرێت یان تووشی کەمئەندامی بێت، ئەم جۆرە ڕێگرییە حەرامە و دروست نییە.

٤- کەسێك ئەمانەتی پارەی کەسێکی تری لایە و چەتەیەك هەڵدەکوتێتە سەری و داوای پارەی لێ دەکات، ئەم لە پێناو پاراستنی پارەکانی خۆی پارەی ئەمانەتەکەی پێ دەدات، ئەم هەڵوێستە شەرعی نییە و دەبێت قەرەبووی پارەکانی ئەمانەتەکە بکاتەوە؛ چونکە ئەم بە پارە و ئەمانەتی خەڵکی زیانی لە پارەکانی خۆی لاداوە و زیان بەزیانێکی هاوشێوەی خۆی لاناچێت.

٥- کەسێك ئۆتۆمبێلێك یان کاڵایەکی فرۆشت بەکەسێکی کە، دواتر کڕیارەکە پاش وەرگرتنی ئۆتۆمبێلەکە بۆی دەرکەوت کە ئۆتۆمبێلەکە کێشەی هەیە و ویستی بۆ خاوەنەکی بگێڕێتەوە، لە ڕێی گەڕانەوەیدا تووشی ڕوداوێك بوو کێشەکانی زیاتر کرد، ئێستا کڕیارەکە بۆی نییە ئۆتۆمبێلەکە بداتەوە بەسەر خاوەنەکیدا؛ چونکە ڕاستە پێشتر ئۆتۆمبێلەکە کێشەی هەبووە و کڕیارەکە زەرەرومەند بووە؛ بەڵام ئێستا کێشەکانی زیاترە

و فرۆشیارەكەیش زەرەرەومەند دەبێت، و زەرەریش بە زەرەر چارەسەر نابێت؛ ئێستا كەسی كڕیار مافی ئەوەی هەیە قەرەبووی كێشە كۆنەكە هەرچەندە لە فرۆشیارەكە وەربگرێتەوە بەلاَم بۆی نییە ئۆتۆمبێلەكە بگێڕێتەوە، بەم شێوەیەش مافی هەردوو لا دەستەبەر دەبێت و زیانەكانیش چارەسەر دەبن.

ئەم حوكمەیش تەنها بۆ ئۆتۆمبێل نییە بەڵكو هەموو كاڵایەك دەگرێتەوە.

٦- هیچ كەسێك بۆی نییە بە پاساوی ناچار كردن و لە پێناو پاراستنی ژیانی خۆی كەسێكی تر بكوژێت؛ چونكە زیانی كوشتنی خۆی هەمان زیانی كوشتنی كەسێكی تری هەیە و زیانیش بە زیانێكی هاوشێوەی خۆی چارەسەر نابێت؛ بەڵام ئەگەر هاتو ناچار كرا لەسەر ئەوەی كەسێك بكوژێت یان عارەق بخواتەوە ئەوە ئەتوانێت عارەقەكە بخواتەوە؛ چونكە زیانی عارەق خواردنەوە لە زیانی كوشتن كەمترە.

٧- هیچ كەس بۆی نییە بەپاساوی ڕزگاركردنی ژیانی كەسێكی تر دڵی خۆی یان سییەكانی پێ ببەخشێت؛ چونكە مردنی خۆی و هەركەسێكی تر لەشەرعدا چون یەكن و زیانیش بە زیانێكی هاوشێوەی خۆی چارەسەر نابێت؛ بەڵام ئاساییە بەهەمان پاساو كەسێك خوێن یان گورچیلە یان بەشێك لە جگەری بەكەسێكی تر ببەخشێت.

## ڕێسای پازدە

## العادة محكمة

**واتە:** داب و نەریت و کلتوری کۆمەلأیەتی بە هەند وەردەگیرێت و لە یەکلا کردنەوەی زۆرێك لە کێشەکاندا کاری پێ دەکرێت و پەنای بۆ دەبرێت.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە یەکێکی ترە لەو پێنج ڕێسا گرنگ و گشتگیرەی فیقهی ئیسلامی کە لە سەرجەم برِگە و بابەتە فیقهییەکاندا ڕەنگدانەوەی هەیە و کاری پێ دەکرێت باتایبەتی بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشە و بابەتانەی کە هیچ دەقێکی شەرعی یان یاسایی یان ڕێکەوتنێکی لەسەر نییە.

سەبارەت بەو داب و نەریتەی کە وەك مەرج تەماشا دەکرێت زانایان دەڵێن: **(هو ماتكرر استعماله حتى اكتسب صفة الإستقرار فى النفوس، والتقبل فى العقول، والرعاية فى التصرفات)**. واتە: بەو ئاکار و گوفتارو ڕەفتارە دەگوترێت کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە تا وای لێ دێت لەدڵ و دەروونی خەڵکدا جێی خۆی دەکاتەوە و لە مێشکو ئاوەزدا بەهەند وەردەگیرێت ولە هەڵسوکەوتیشدا ڕەچاو دەکرێت.

چەند ڕێسایەکی ترمان هەیە جەخت لەسەر هەمان واتە و مەبەست دەکەنەوە لەوانە:

- **(المعروف عرفا كالمشروط شرطا)**. واتە: هەر شتێك کە لە ڕێی نەریتێکەوە زانرابێت، وەك ئەوە وایە بەمەرج گیرابێت.
- **(الثابت بالعرف كالثابت بالنص)**. واتە: هەر شتێك کە نەریتێك پشتڕاستی بکاتەوە، وەك ئەو شتە وایە کە دەقێك پشتڕاستی بکاتەوە.

ئەو نەریتانەیش کە ڕێساکە دەیگرێتەوە بریتییە لە:

- نەریتی گوفتاری **(العرف القولى)**: بۆ نموونە: وشەی **(ولد)** لەزمانی عەرەبیدا بۆ منداڵ بەکار دێت کوڕ بێت یان کچ جیاوازی نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾. (النساء:١١). واتە: خوای گەورە سپاردەی منداڵەکانتان دەکات، نێرینەکانییان دوو هێندەی مێینەکانیان پێ بدەن، کەواتە وشەی **(ولد)** هەردوو

ڕەگەزەکە دەگرێتەوە و دواتر (ابن) بۆ کوڕ و (بنت) بۆ کچ بەکاردەهێنرێت، بەڵام لە کلتوری زمانی عەرەبیدا وشەی (ولد) تەنها بۆ کوڕ بەکاردێت.

- نەریتی کرداری (العرف العملی): ئێمە دەزانین بنەمای سەرەکی هەر مامەڵەو گرێبەستێك بەر لە هەموو شتێك ڕێکەوتنی زارەکیی نێوان لایەنەکانە لەسەر نرخی کاڵاکە و دەربڕینی ڕەزامەندییانە لەسەر ئەنجامدانی گرێبەستەکە؛ بەڵام ئەمە لە زۆرێك لە مامەڵەکانی ئێستاماندا ڕوو نادات، وەك سەرجەم ئەو کڕین و فرۆشتنانەی کە لەڕێگەی پێدان و ڕادەست کردنەوە کە بە (بیع المعاطاة) ناسراوە ڕوو دەدات، کە تێیدا لایەنەکانی گرێبەستەکە بێ ئەوەی هیچ قسەیەك لەگەڵ یەك بکەن، یان ڕێکەوتن و سەودایەك لەگەڵ یەك بکەن کڕین و فرۆشتنەکە ئەنجام دەدەن، وەك ئەوەی ئەمڕۆ لە مارکێتەکان یان نانەواکان دەگوزەرێت و کەسێك دەڕوات هەشت نان هەڵدەگرێت و هەزار دینار دادەنێت، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، یان کەسێك دەڕوات لە مارکێتێك ١٠٠ جۆر شمەك و کاڵا هەڵدەگرێت و دواتر دێتە بەردەم کاشێرەکە و شمەکەکان لە بارکۆد دەدات و پارەکەی دەدات، بەبێ ئەوەی سەوداو مامەڵەی کاڵاکان بکات، ئەوەی لەم جۆرە مامەڵانەدا ڕوو دەدات ڕێکەوتنێکی ناوەکیی و ڕەزامەندی دەروونی لایەنەکانە بە ئەنجامدانی گرێبەستەکە و ئەمەیش مەبەستی سەرەکی دانانی مەرجی ڕازیبوونە بە گرێبەستەکە و لە ئێستادا و لە پێناو بەرژەوەندی گشتی و خێرا ڕایی کردنی مامەڵەکانی خەڵکی و پشت ئەستور بە نەریتی خەڵك ڕێگەی پێدراوە و چاو پۆشی لێکراوە.

- نەریتی یاسایی (العرف القانوني): بۆنموونە: لە زمانی عەرەبیدا بچوکترین دەستدرێژی کردنە سەر کەسی بەرامبەر بە (جناية) ناوزەند دەکرێت، بەڵام لە نەریتی دادگا و دادوەریدا ئەم وشەیە تەنها بۆ تاوانە گەورەکان بەکاردێت.

بەشەکان: بەشێوەیەکی گشتی داب و نەریتەکان دابەش دەبن بەسەر دوو تەوەردا:

یەکەم: نەریتە گشتییەکان: (العرف العام): بەو نەریتانە دەگوترێت کە لەناو هەموو خەڵکیدا باوە و زانراوە، بۆنموونە: وشەی (الصلاة) لەزمانی عەرەبیدا بەواتەی نزا هاتووە، بەڵام لە نەریتی شەرعدا و لای هەموو بڕواداران لەسەرتاسەری جیهاندا بە نوێژ ناسراوە، کە پەرستشێکی دیاریکراوە، بەهەمان شێوە وشەکانی (الصيام، الزكاة، الحج، الجهاد، الحدود)

هەموو ئەمانە و بەسەدەها زاراوەی تر هەن لەزمانی عەرەبیدا واتەیەکی تایبەتیان هەیە و بەڵام لە زاراوە و نەریتی شەرع و لەنێو موسوڵماناندا هەریەکەیان بۆ پەرستشێکی شەرعی دیاریکراو بەکار هێنراوە.

دووەم: نەریتە تایبەتییەکان **(العرف الخاص)**: بەو نەریتانە دەگوترێت کە لەناوچەیەکی تایبەت، یان لە نێو خاوەن پیشەیەکی تایبەتدا ناسراوە و گشگیر نین. بۆ نموونە: وشەی دەفتەر لە نەریتی بۆرسە و بازاڕی دۆلاری کوردستاندا بە ($١٠.٠٠٠) دەگوترێت و شەی گەڵا بە ($١٠٠) دەگوترێت، ئەمە لەکاتێکدا کە وشەی دەفتەر لەناو خەڵکی گشتیدا بۆ تیانووس بەکار دێت و وشەی گەڵایش بۆ بەشێکی درەخت بەکار دێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایان و سەرجەم سەرچاوەکانی تری حوکمی شەرعییەوە وەرگیراوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ﴾. (الأعراف: ١٩٩). واتە: لێبوردە و سنگ فراوان بەو فەرمان بەچاکە و بەو نەریتە باشانە بکە پێش ئیسلام لەناو کۆمەڵگەدا هەبووە.

٢- وە دەفەرموێت: ﴿وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾. (البقرة: ٢٣٣). واتە: ئەرکی بەخێوکردن و دابینکردنی بژێوی ژیانی هاوسەرەکان لە ئەستۆی باوکی منداڵەکانە بە گوێرەی داب و نەریتی ئەو کۆمەڵگەیەی کە تێیدا دەژین.

٣- وە دەفەرموێت: ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ﴾. (المائدة: ٨٩). واتە: کەفارەتی سوێند پێدانی خواردنی دەکەسی هەژارە لەو خواردنە مامناوەندەی کە دەرخواردی خانەوادەکانتانی دەدەن.

٤- وە دەفەرموێت: ﴿إِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾. (سورة يوسف: ٢٦). واتە: ئەگەر کراسەکەی لە پێشەوە دڕابوو ئەوە ئافرەتەکە ڕاست دەکات کەدەڵێت ئەو پەلاماری داوم و یوسف درۆ دەکات کە دەڵێت خێزانەکەی عەزیزی میسر پەلاماری منی داوە.

٥- خاتو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هیندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبو سوفیان هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و سکاڵای لە ئەبو سوفیانی هاوسەری کرد و گوتی: ئەی

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە و هێندە خەرجی بە من و منداڵەکانم نادات کە بەشمان بکات و پێی بژین، ئایا دەتوانم ئەوەندە لە پارەکانی ببەم کە بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:{خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ}.(رواه البخاري). واتە: ئەوەندە ببە کە بەپێی داب و نەریت بەشی خۆت و منداڵەکانت دەکات.

٦- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {الْمِكْيَالُ مِكْيَالُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، وَالْوَزْنُ وَزْنُ أَهْلِ مَكَّةَ}. (رواه أبو داود والبيهقي والنسائي). واتە: پێوانەی شەرعی پێوانەی خەڵکی مەدینەیە و کێشانەیش کێشانەی خەڵکی مەککەیە. لەبەر ئەوەی خەڵکی مەدینە سەرقاڵی کشتوکاڵ بوون و پێوانەی ئەوان زیاتر باو بوو، خەڵکی مەککەیش سەرقاڵی بازرگانی بوون و کێشانەی ئەوان زیاتر باو بووە.

٧- پیاوێك دێتە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و لێی دەپرسێت: هاوڕێیەکمان نەزری کردوە ئاژەڵێك سەرببڕێت، بەڵام دیاری نەکردوە چ جۆرە ئاژەڵێك سەرببڕێت، ئایا ئەگەر مانگایەك سەر ببڕێت نەزرەکەی لەکۆڵ دەکەوێت، عەبدوڵڵا پێی گوت: هاوڕێکەتان خەڵکی کوێیە؟. گوتی: خەڵکی بەنی ڕیاحە، گوتی: ئەوە لەکەیەوە بەنو ریاح مانگایان بەخێو کردووە، مەبەستی هاوڕێکەتان حوشتر بووە و بە مانگا لەکۆڵی ناکەوێت.

جا ئەگەر سەرنج بدەین لە هەموو ئەو دەقانە دەبینین بۆ یەکلاکردنەوەی بابەتەکان شەرع گەڕاوەتەوە سەر داب و نەریتی کۆمەڵگەکان نەك شتێکی تر.

مەرجەکان: بۆ کارپێکردنی ئەم ڕێسایە پێویستە کۆمەڵێك مەرج بوونی هەبێت لەوانە:

١- نەریتەکە بەردەوام و گشتگیر و جێگیر بێت و لای هەموو خەڵکی زانراو بێت؛ بەڵام ئەگەر نەریتەکە تەنها لە ناو کۆمەڵێك خەڵکی تایبەتدا یان خاوەن پیشەیەکی دیاریکراودا ناسراو بێت ئەو کات گشتگیر نابێت و تەنها لەو بازنەیەدا کاری پێ دەکرێت کە تێیدا ناسراوە.

٢- نەریتەکە پێچەوانەی بەڵگەیەکی شەرعی نەبێت؛ چونکە هەر نەریتێك پێچەوانەی بەڵگەیەکی شەرعی بێت کاری پێ ناکرێت و هەڵدەوەشێتەوە و هەمیشە دەق لە

سەروو هەموو بەڵگەو بنەمایەکی ترەوەیە و نەریت شەرعییەتی لەدەقەوە وەرگرتووە و ناکرێت پێچەوانەی سەرچاوەکەی خۆی بوەستێتەوە.

٣- نەریتەکە پێشتر و لەئێستادا کە بۆی دەگەڕێینەوە بوون و بەردەوامی هەبێت، نەك دواتر دروست بێت. هەر وەك ڕێساکە دەڵێت: (العرف إنما يعتبر إذا كان مقارنا لا لاحقا). واتە: نەریت کاتێك کاری پێ دەکرێت کە لە کاتی کارپێکردنی بوونی هەبێت، نەك پاشتر دروست بێت.

٤- ڕێکەوتنێك بە پێچەوانەی ئەو نەریتەوە لە نێوان لایەنەکانی کارەکەدا نەبێت؛ چونکە لە بوونی هەر ڕێکەوتنێکی نێوان خۆیاندا نەریتەکە کاری پێ ناکرێت، بۆ نموونە: کەسێك خانو یان ئۆتۆمبیلێك دەکڕێت و نەریتی ئەو جۆرە مامەڵانە وایە کە کەسی کڕیار پارەی ڕێوڕەسمی گواستنەوەی خاوەندارێتییەکەی دەدات، بەڵام ئەگەر لە گرێبەستەکەدا ڕێکەوتن کە کەسی فرۆشیار ئەو خەرجییانە بگرێتە ئەستۆ ئەو کات کار بە هیچ نەریتێکی تر ناکرێت، بەڵکو کار بە ڕێکەوتنی لایەنەکانی گرێبەستەکە خۆیان دەکرێت.

هەر نەریتێك یەکێك لەم مەرجانەی تێدا نەبوو کاری پێ ناکرێت و بەبەڵگە ئەژمار ناکرێت.

**نموونە:**

١- هەڵسوکەوتی زۆر لەکاتی نوێژدا نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، بۆ دیاریکردنی زۆری و کەمی ئەو هەڵسوکەوتانەی کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە دەگەڕێینەوە بۆ نەریتی خەڵك.

٢- یەکێك لەمەرجەکانی بڕینی دەست لە کاتی دزیدا ئەوەیە کە کەسەکە ماڵە دزراوەکەی لەشوێنی تایبەتی پاراستنی خۆی دەرهێنابێت و دزیبێت کە لە شەرعدا پێی دەگوترێت (حرز) و هەر کاڵایەکیش (حرز) ی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆ نموونە پارە یان ئاڵتون قاسەی هەیە، مانگا گەوڕی هەیە، ئۆتۆمبێل گەراجی هەیە، و هەر کاڵایەکی تریش نەریتی کۆمەڵگە دیاری دەکات کە (حرز) ی پاراستنی چییەو چۆنە. بۆ نموونە: ئافرەتێك حەوشەی شۆردوە و لەسەر تەنکی حەوشە بازنەکانی داناوە ، کرێکاری پاکەرەوەی خۆڵەکە هاتوە و بازنەکانی خستۆتە گیرفانی ئەم کەسە ناڵێین دز نییە بەڵآم دەستی نابڕدرێت،

چونکە سەر تەنکی حەوشە شوێنی هەڵگرتن وپاراستنی بازن نییە، نە لەڕوی عورفەوە نەلە ڕوی شەرعەوە.

٣- بەسەرکردنەوەی خزم و کەسوکار لە شەرعدا کارێکی فەرمان پێکراوە، بەڵام شەرع شێوازی ئەم بەسەرکردنەوەیەی دیاری نەکردووە، کە هەر دەبێت بەسەردان بێت؛ بۆیە دەکرێت لە ئێستادا تەلەفۆن و نامە و ئامێرە ئەلکترۆکان بەشێك بن لە ئامرازەکانی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە .

٤- ئەرکەکانی ئافرەت لەماڵدا لە نانکردن، چێشت لێنان، جل شۆردن، پاکردنەوەی ماڵ، هیچ کام لەمانە بەڵگەی شەرعی لەسەر نییە کە ئەرکی ئافرەت بن و بۆ یەکلاکردنەوەیان پێویستە بگەڕێینەوە سەر نەریتی کۆمەڵگەکان، ئەوەی لەکۆمەڵگەدا ئافرەت دەیکرد پێویستە هەموو ئافرەتێك پێوەی پابەند بێت، ئەوەیش کە ئافرەت نەیدەکرد بەئەرکی ئەو ئەژمار ناکرێت و ئەمەیش بەپێی کلتوری کۆمەڵگەکان و بنەماڵەکان دەگۆڕێت.

٥- بۆ یەکلاکردنەوەی زۆربەی کێشەکانی خێزان وەك دیارکردنی بڕی مارەیی، یان خەرجی و بژێوی خێزان کە پۆشاك و خواردن و خواردنەوە و شوێنی نیشتەجێبوون و پارەی چارەسەری نەخۆشی دەگرێتەوە، بۆ دیاریکردنی هەموو ئەوانە دەگەڕێینەوە سەر داب و نەریتی کۆمەڵگەکان.

٦- لە کاتی جیابوونەوەی هاوسەرەکان و بوونی کێشە لەسەر چۆنێتی دابەشکردنی کەلوپەلەکانی ناوماڵ دەگەڕێینەوە سەر نەریتی کۆمەڵگەکان، ئەوەی کە تایبەت بوو بە ئافرەتان لە جل و بەرگ و هۆکارەکانی خۆڕازاندنەوە ئافرەتەکە دەیبات، ئەوەیشی تایبەت بوو بە پیاوان پیاوەکە دەیبات.

٧- شێوازی مامەڵە کردن لە بۆنەو پرسە کۆمەڵایەتییەکان نەریتی کۆمەڵگەکان دیاری دەکات بۆ نموونە: کاتێك دەچینە هۆڵی شەکراو خواردنەوەوە، سەرنج دەدەیت هیچ کەس دەست بۆ شیرینی و خواردنەکانی سەر مێزەکە نابات تا مامۆستا قسەکانی تەواو نەکات. یان لە هۆڵی پرسەدا هیچ کەس قاچ ناخاتە سەر قاچ. یان هیچ ئافرەتێك جلی زەرد و سور بۆ بۆنەی پرسە لەبەر ناکات. یان کەسێك تازە ماڵ پێکەوە دەنێت یان خانوی تازە دەکرێت

یان منداڵی دەبێت دۆستان و خۆشەویستانیان سەردانیان دەکەن و دیارییان بۆ دەبەن و دەستباریان دەکەن. سەرچاوەی هەموو ئەمانە داب و نەریتی کۆمەڵگەکان خۆیانە نەك بەڵگە شەرعییەکان.

٨- کەسێك سوێندی خوارد کە گۆشت نەخوات، بەڵام دواتر ماسی خوارد، سوێندەکەی ناکەوێت، چونکە لە نەریتی ئێمەدا بە ماسی ناوترێت گۆشت، هەر پێی دەڵێیت ماسی، بەڵام گۆشت بریتییە لە گۆشتی ئاژەڵی وەك مەڕو بزنو مانگا و ئەو بابەتانە.

٩- لە کاتی ئاڵوگۆڕکردنی دراودا پێویستە دەستاودەست ئاڵوگۆڕەکە ئەنجام بدرێت، لە ئێستادا پێدانی چەکی بانك و داخڵ کردنە سەر حیسابی بانکی جێی دەستاودەستکردن دەگرێتەوە.

١٠- لۆگۆ، مارکە، دروشم، بیرۆکەی زانستی یان بازرگانی، تەنانەت قسەو پۆست و کۆمێنت هەموو ئەوانە لەسەردەمی زانایانی کۆندا بوونیان نەبووە و بەهەند وەرنەگیراون؛ بەڵام لە ئێستادا هەر یەك لەوانە نرخی تایبەتی خۆیان هەیە و خاوەندارێتی دەکرێن و هیچ کەس بۆی نییە بەبێ پرسی خاوەنەکانیان بەکاریان بهێنێت یان لاساییان بکاتەوە و هەر کەسێك کاری لەو جۆرە بکات دەچێتە ژێر پەردەی دزی و خیانەتەوە.

١١- لە گەڕەکێکی تێکەڵ بە مەسیحی و مسوڵمان منداڵێکی ساوا فڕێ دراوە و مردووە، بۆ یەکلاکردنەوی ئەوەی کە بزانین موسوڵمانە یان مەسیحییە دەگەڕێینەوە سەر سەیرکردنی شمەك و جل و بەرگەکانی، ئەگەر لە جل وبەرگی بڕواداران دەچوو یان ناونیشانێکی ئیسلامیانەی پێوەو بوو وەك قاب قورئانێك ئەوکاتە وەك موسوڵمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و بەڕێوڕەسمی ئیسلامی نوێژی لەسەر دەکرێت و کفن و دفن دەکرێت، خۆ ئەگەریش هی مەسیحییەکانی لەبەر بوو ئەوە ڕادەستی خۆیان دەکرێتەوە تا بەپێی ڕێوڕەسمی ئاینەکەی خۆیان مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

هەموو ئەمانە و سەدان نموونەی دیکەمان هەیە کە تێیدا دەگەڕێنەوە سەر داب و نەریت و کلتوری کۆمەڵگەکان بۆ یەکلاکردنەوەی حوکمە شەرعییەکانیان.

## ڕێسای شازدە

## المعدوم شرعا كالمعدوم حسا

**واتە:** ئەوەی كە شەرع دانی پێدا نەنێت و لەگەڵ بنەما و مەرج و ڕێكارەكانی یەك نەكاتەوە، وەك نەبوو مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایەیە ڕامان دەهێنێت كە پابەند بین بەبنەماكانی شەرعەوە و فێرمان دەكات كە تاكە ڕێگە بۆ گەیشتن بەمەبەست و ئامانجەكان و بەدیهێنانی حەز و ئاواتەكان ڕێگەی شەرعە و هەر ڕێگەیەكی تری پێچەوانەی شەرع لەو پێناوەدا بگیرێتە بەر لەڕویشەرعەوە بە نەبوو ئەژمار دەكرێت و هیچ لێكەوتەیەكی شەرعی نابێت.

چەند ڕێسایەكی ترمان هەیە جەخت لەسەر هەمان واتە دەكەنەوە لەوانە: **(لا حكم للباطل)**. واتە: كاری پوچ و بێ بنەما هیچ حوكمێكی لێ وەرناگیرێت. یان **(مابني على الباطل فهو باطل)**. واتە: هەرچی كارێك بنەماكەی پوچ بێت، هەموو لێكەوتەكانیشی بە پووچ ئەژمار دەكرێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾. (الإسراء: ٨١). واتە: كاری پوچ لەناوچو بێ بەهایە و ئایەتەكیش گشتگیرە و هەموو كردەوەكانی مرۆڤ دەگرێتەوە لەسەرجەم بوارەكانی ژیاندا.

٢- پێغەمبەری خوادا دەفەرموێت: واتە: هەركەس شتێك بكات كە لەم ئاینەی ئێمەدا نەبێت، كاری پێ ناكرێت و لێی سەر ناگیرێت.

**نموونە:**

١- هەر كەسێك لەڕێگەی داگیركردن یان دزی یان بەرتیل یان درۆ یان هەر ڕێگەیەكی ناشەرعی تر مافێك یانماڵێك بەدەست بهێنێت، شەرع دان بەخاوەندارێتی ئەو مافە یان ماڵەدا نانێت و پێویستە كەسەكە بۆ خاوەنە شەرعییەكەی بگێڕێتەوە.

٢- بازرگانی کردن بەو شتانەی کە حەرامن لە نموونەی: مەی، گۆشتی بەراز، مادەی هۆشبەر، جگەرە و نێرگەلە، ماڵی دزراو، کرێی پیاو کوشتن و داوێن پیسی دروست نییە و هیچ گرێبەستێکی کڕین و فرۆشتن یان بەکرێدانیان لەسەر دانامەزێت و شەرع دان بەخاوەندارێتیدا نانێت.

٣- ئافرەتێکی موسوڵمان هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی ناموسوڵمان بکات، هەر ئاین و ئایدیایەکی هەبێت، هاوسەرگیرییەکەی و سەرجەم لێکەوتەکانیشی بە حەرام و ناشەرعی ئەژمار دەکرێت و هەر لەبنەڕەتدا دانامەزرێت، خۆ ئەگەر پیاوەکە سەرەتا موسوڵمان بوو پاشان ئاینی گۆڕی، بەهەمان شێوە پرۆسەی هاوسەرگیرییەکیان هەڵدەوەشێتەوە و لێك جیا دەکرێنەوە.

٤- ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا نوێژ و ڕۆژو مانەوە لە مزگەوت و کاری سەرجێی ئەنجام نادات، وە هەر کات بەو حاڵەوە یەکێك لەو کارانەی ئەنجامدا، نەك هەر لێی وەرناگیرێت بەڵکو تاوانباریش دەبێت و لەسەری سزا دەدرێت.

٥- ئەنجامدانی گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك کە لەعیددەی هاوسەرگیرییەکی پێشتردا بێت حەرامە و دروست نییە و ئەگەریش کرا بەهەند وەرناگیرێت و هیچ لیکەوتەیەکی شەرعی نابێت.

٦- کەسێك بەزۆر هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێك بکات و ئافرەتەکە ناڕازی بێت گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەیان دانەمزرێت و هەرچەندی بەسەردا بڕوات و هەرچیشی لێ بکەوێتەوە هەر نادروستە و پێویستە هەڵبوەشێتەوە، خۆ ئەگەر دواتر ئافرەتەکەش ڕازی بوو ئەوە پێویستە گرێبەستی هاوسەرگیرییان بۆ تازە بکرێتەوە؛ چنکە ئەو گرێبەستەی یەکەم هیچ بەها و بنەمایەکی شەرعی نییە.

٧- هەر بڕیارێك لە دادگا دەرچوو لەسەر بنەمای بەڵگەیەکی ساختە یان شایەتیەکی درۆ بڕیارەکە دانامەزرێت و هەڵدەوەشێتەوە؛ چونکە لەسەر بەڵگەیەکی بێ بنەما دامەزراوە.

بەزۆر تەڵاقدانیش یان کڕین و فرۆشتن یان هەر مامەڵە و هەڵسوکەوتێکی تر هەر هەمان حوکمی هەیە و هیچ کامیان دانامەزرێن و لێکەوتەی شەرعییان نابێت.

٨- هەر مامەڵەیەك سووی تێدا بێت شەرعی نییە و دانامەزرێت و پێویستە هەڵبوەشێتەوە.

٩- لە گرێبەستی وەكالەتدا هەر كات كەسی یەكەم كە موەكیلە شیاوی یاسایی لەدەستدا بریكارەكەیشی بەهەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت و مافی ڕییكردنی مامەڵەكەی نابێت، چونكە ئەو لەبری ئەو كارەكە دەكات و هەمان مامەڵەی ئەوی لەگەڵدا دەكرێت.

سەرەم ئەمانە و هەرچی كار و گوفتار و مامەڵە و هەڵسوكەوت و هەڵوێستی مرۆڤەكان هەیە بە پێی بنەما شەرعییەكان مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێت و ئەوەی بەپێی بنەما و مەرج و ڕێكارە شەرعییەكان دروست بوو كاری پێ دەكرێت و ئەوەیش بە پێچەوانەی ئەوانەوە بوو بەنەبوو ئەژمار دەكرێت.

## ڕێسای حەڤدە

## أحكام الشريعة مبنية على الإحتياط

واتە: حوکمە شەرعییەکان لەسەر بنەمای خۆپارێزی دامەزراون و پێویستە بە ئاگاییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

گرنگی: گرنگی ڕێساکە لەوەدایە کە مرۆڤ ڕادێنێت لەسەر ئەوەی کە هەمیشە سنورێك بهێڵێتەوە لەنێوان خۆی و سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی شەرعدا و خۆی بەدوور بگرێت لەهەر شتێك کە بۆنی حەرام یان گومانی حەرامبوونی لێ دەکرێت، ئەم جۆرە خۆپارێزییەیش دابەش دەبێت بەسەر دوو تەوەردا:

یەکەم: کردن (الإحتياط في الفعل): بەوەی کەسەکە پابەندبێت بەکردنی هەموو ئەو شتانەوە کە گومانی هەیە و دوودڵە لەوەی مافی خوای گەورەن یاخود مافی خەڵکین و لەسەر ئەم پێویستن و کەمتەرخەمی لە کردن و جێبەجێ کردنیاندا نەکات.

دووەم: نەکردن (الإحتياط في الترك): بەوەی کەسەکە پابەند بێت بەنەکردن و وازهێنان لە هەموو ئەو شتانەی کە گومانی حەرامی و یاساغبوونیان لێ دەکرێت و بەهیچ شێوەیەك خۆی لێیان نزیك نەکاتەوە.

سەبارەت بە حوکمی شەرعی ئەو جۆرە خۆپارێزییەیش دوو جۆری هەیە:

یەکەم: خۆپارێزی پێویست (الإحتياط الواجب): لەم جۆرەیاندا کەسەکە پێویستە کار بە ڕێسای خۆپارێزییەکە بکات و ئەگەر گومانەکە لە بەشی کردن بوو کارەکە بکات و پێوەی پابەند بێت، ئەگەریش لەبەشی نەکردن بوو وازی لێ بهێنێت و هەرگیز خۆی لێ نزیك نەکاتەوە.

دووەم: خۆپارێزی باشتر (الإحتياط المستحب): لەم جۆرەیاندا کەسەکە باشتر وایە پابەند بێت بە ڕێسای خۆپارێزییەوە، بەڵام پێویست و واجب نییە و ئەگەر پابەند نەبوو گوناهبار نابێت، وەك ئەوەی کەسێك کە دەیەوێت بەڕۆژووبێت باشتر وایە پێش بانگی بەیانی بەماوەیەك دەست لەخواردن و خواردنەوە هەڵبگرێت، ئەگەر پابەند نەبوو، وەتا

كاتی بانگ شتی خوارد گوناهبار نابێت و ڕۆژووەكەی دروستە، بەمەرجێك كەبانگی دا ئیتر دەست بگرێتەوەو هیچ نەخوات.

ئامانجی هەموو ئەوانەیش كەباسمان كرد ئەوەیە كە مرۆڤی باوەڕدار دین و دوارۆژی سەلامەت بێت و دونیایشی ئاسودە، چونكە ئەگەر كارێك پێویست نەبوبێت و تۆ لەبەر خوای گەورە كردبێتت ئەوە بەدڵنیاییەوە پاداشتەكەی لای خوای گەورە وەردەگریت و ون نابێت، ئەگەریش كارێك خۆی لەخۆیدا حەرامیش نەبوبێت و تۆ لەبەر خوای گەورەوە بەهۆی بونی گومانێكەوە وازت لێ هێنابێت ئەوە دیسان بەدڵنیاییەوە پاداشتی لای خوای گەورە وەردەگریت، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە شتە گوماناوییەكانت كرد ئەو كات ئەگەر هەیە حەرامت كردبێت و بێ گومان لە سزای خوای گەورە دەرناچیت.

**سەرچاوە:** ڕێساكە لە چەندین دەقی فەرموودەو قسەی هاوەڵانەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: {فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ، قَدِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ، وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ، وَقَعَ فِي الْحَرَامِ}.(رواه مسلم). واتە: هەركەسێك خۆی لە شتی گوماناوی پاراست، ئەوە ئاین و كەرامەتیشی پارێزراوە، هەركەسیش كەوتە كاری گوماناوییەوە ئەوە كەوتۆتە حەرامەوە.

٢- وە دەفەرمویت {وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ}. (رواه مسلم). واتە: تاوان شتێكە لە دڵدا پەنگ دەخواتەوە و لێی بەگومانیت و حەزیش ناكەیت خەڵك بزانێت كە بیرت لە كارێكی لەو جۆرە كردۆتەوە.

٤- وە دەفەرمویت: {دَعْ مَا يُرِيبُكَ إِلَى مَا لَا يُرِيبُكَ}.(رواه أحمد وابن حبان وابن خزيمة). واتە: واز لە هەر شتێك بهێنە كە گومانت لێی هەیە حەرام بێت و شتێك بكە كە دڵنیا بیت لەوەی حەڵاڵە.

٥- وە دەفەرمویت: {لَا يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ، حَتَّى يَدَعَ مَا لَا بَأْسَ بِهِ حَذَرًا لِمَا بِهِ بَأْسٌ}.(رواه البيهقي، السنن الكبرى). واتە: مرۆڤ ناگاتە ئەو پلەیەی كە بەخواناس و لەخواترس ئەژمار بكرێت، هەتا لەترسی حەرامەكان واز لە هەموو ئەو شتانەیش نەهێنێت كە گومانی حەرامییان لێ دەكرێت.

٦- ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خودا ﷺ بە ڕێگەیەکدا دەڕۆشت خورمایەکی بینی کەوتبوو، فەرمووی: {لَوْلاَ أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ مِنَ الصَّدَقَةِ لَأَكَلْتُهَا}.(رواه البخاري و مسلم). واتە: ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە ئەم خورمایە لەوانەیە خێری خەڵك بێت هەڵم دەگرتەوە و دەمخوارد. کەواتە بە گومانی ئەوەی کە لەوانەیە خێر بێت و خێریش بە پێغەمبەر ﷺ ناشێت، خورماکەی نەخوارد.

٧- عەدی کوڕی حاتەم دەڵێت: جارێکیان لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی و گوتم: ئێمە دەچین بۆ ڕاو، سەگ لەگەڵ خۆمان دەبەین، سەگەکە بەردەدەینە نێچیرەکە ئایا ئەو نێچیرە بخۆین کە سەگەکە دەیگرێت یان نا؟ فەرمووی: {إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ فَقَتَلَ فَكُلْ، وَإِذَا أَكَلَ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ}.واتە: ئەگەر ئەو سەگەی بەری دەدەیتە نێچیرەکە ڕاهێنراو بوو لەسەر ڕاو ئەوە لەگۆشتی ئەو نێچیرە بخۆ کە ڕاوی دەکات، بەڵام ئەگەر سەگەکە خۆی لە گۆشتی نێچیرەکەی خوارد ئەوە تۆ لێی مەخۆ؛ چونکە دیارە بۆ خۆی ڕاو کردوە بۆیە لێی خواردوە. دەڵێت: گوتم ئەی ئەگەر کاتێك چومە سەر نێچیرەکە بینیم سەگێکی تری لەسەرە لەگەڵ سەگەکەی خۆمدا؟. فەرمووی: {فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى كَلْبٍ آخَرَ}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: هەر مەیخۆ؛ چونکە سەگەکەی خۆت ڕاهێنراوە و لەکاتی بەردانیدا بۆ نێچیرەکە ناوی خوات لەسەر هێناوە، بەڵام ناوی خوات لەسەر ڕاوی سەگێکی تر نەهێناوە و دڵنیایش نیت کە کام سەگەیان نێچیرەکەی ڕاو کردوە.

ئەگەر سەرنجی ئەو فەرموودانە بدەین دەبینین هەموویان جەخت لەسەر پۆلێنکردنی شتە گوماناوییەکان لە خانەی حەرامدا دەکەنەوە و داوای وازلێهێنانیان دەکەن.

٨- پێشەوا عومەر دەڵێت: (تَرَكْنَا تِسْعَةَ أَعْشَارِ الْحَلاَلِ مَخَافَةَ الرِّبَا).(رواه عبد الرزاق في المصنف). واتە: ئێمە نۆ لەسەر دەی مامەڵە حەڵاڵەکانیشمان واز لێ دەهێنا لەترسی ئەوەی کە تووشی سوو نەبین.

**نموونە:**

١- کەسێك لە کاتی نوێژ یان ڕۆژو یان طەواف یان زەکات گومانی بۆ دروست بوو لەڕووی چەندێتییەوە، ئەو کات کار بەکەمترین ڕێژە دەکات کە لێی دڵنیایە و ئەوەی لێی

بەگومانە ئەژماری ناکات، نەبا پەرستشەکەی کەم و کورت بێت و دروست نەبێت و بەو هۆیەوە تووشی حەرام بێت.

٢- لە بابەتی تاوان و سزا شەرعییەکاندا، تا لە ڕێی بەڵگەی یەکلاکەرەوەوە تەواو دڵنیا نەبین لەوەی کە کەسێك تاوانێکی کردوە ناتوانین بە گومان سزای بدەین و تۆڵەی لێ بکەینەوە، جا تاوانەکە کوشتن بێت یان زینا یان دزی ین هەر تاوانێکی تر جیاوازی نییە.

٣- ئەو کەسەی دەیەوێت لەکاتی حەج یان عەمرەدا طەواف بکات و بەدەوری کەعبەدا بسوڕێتەوە، باشتر وایە پێش سوچی بەردە ڕەشەکە بوەستێت و دەست پێبکات، چونکە ئەگەر ڕاستەوخۆ بەرامبەر بەردە ڕەشەکە دەست پێبکات، ئەو کات لەوانەیە بەشێکی بەردەڕەشەکەی جێهێشتبێت و کەوتبێتە پشتییەوە و ئەوکات طەواف و سوڕانەوەکەی دروست نابێت؛ بۆلابردنی ئەو گومانە باشتر وایە یەك دوو هەنگاو پێشتر نیەت بهێنێت و دەست پێبکات.

٤- کەسێك بڕێك پارەی دۆزیەوە نابێت بیداتەوە بەهیچ کەسێك تا لە ڕێی بەڵگەوە تەواو بۆی یەکلا نەبێتەوە کە خاوەنی ڕاستەقینەی خۆیەتی؛ چونکە ئەگەر بە گومان ڕادەستی کەسێکی کرد و دواتر خاوەنی ڕاستەقینەی پارەکە پەیدا بوو، ئەو کات دەبێت لەگیرفانی خۆی قەرەبووی خاوەنەکەی بکاتەوە؛ جونکە بەهۆی گومان و کەمتەرخەمی ئەمەوە پارەکە تیاچووە.

٥- ئەو نەخۆشانەی کە مێشکیان دەمرێت، تا تەواو دڵنیا نەبین لە لەکار کەوتنی مێشکیان و بێ هیوا نەبین لە دووبارە بەگەڕکەوتنەوەی، کەس بۆی نییە ئامێرەکانی بوژانەوەو هەناسەدانی دەستکردیان لەسەر هەڵبگرێت.

٦- کەسێك هەڕەشەی کوشتنی لەسەرە ئەگەر کوفر نەکات، هەرچەندە بۆی هەیە کوفر بکات و کافریش نابێت؛ بەڵام باشتر وایە دان بەخۆیدا بگرێت و خوای گەورە و ئاینەکەی بخاتە پێش ژیانی خۆیەوە و کوفر نەکات.

## ڕێسای هەژدە

## إذا اجتمع الحلال والحرام غلب الحرام

**واتە:** ئەگەر حەڵاڵ و حەرام لە شتێکدا یان کارێکدا کۆبونەوە حوکمی حەرامەکە زاڵ دەبێت و ئەو شتە یان ئەو کارە حەرام دەبێت.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە تەواوکاری ڕێسای پێشوە و بۆ ئاگادارکردنەوەی بڕوادارانە کە خۆیان لە هەر شتێك یان کارێك بەدوور بگرن کە بەهۆی بەرکەوتنی لەگەڵ حەرامێکدا گومانی حەرامبوونی لێ دەکرێت، ئەمەیش لە پێناو پاراستنی سەلامەتی دین و قیامەتی خۆیانە؛ چونکە حەرامەکان کاری زیان بەخشن و واز لێ هێنانیان لەبەر خۆپارستنە لە زیانەکانیان، بەڵام وازهێنان لە هەندێك لە حەڵاڵەکان هیچ زیانێکی تێدا نییە، هەر بۆیە لە کاتی دروستبوونی گوماندا خۆ لادان لە زیانەکان لە ڕووی شەرعەوە بەهەند وەردەگیرێت.

ئەم جۆرە تێکەڵییەیش لەنێوان حەرام و حەڵاڵەکاندا دوو شێوازی هەیە:

١- تێکەڵی لەیەك شتدا: بۆ نموونە شتێکمان هەیە خودی خۆی لەڕوویەکەوە حەڵاڵە و لە ڕوویەکی ترەوە حەرامە، لەم کاتەدا بە حەرام ئەژمار دەکرێت. بۆ نموونە: ئەگەر گیاندارێك بەرهەمی جووتبوونی دوو ئاژەڵ بوو، یەکێکیان گۆشتی دەخورا و ئەوی تریان گۆشتی نەدەخورا ، گۆشتی ئەو گیاندارە حەرامە.

٢- تێکەڵی لەدوو شتدا: وەك ئەوەی شتێکی حەڵاڵ تێکەڵ بە شتێکی حەرام بێت و نەتوانین لێکیان جیا بکەینەوە، لەم کاتەدا کۆی شتەکە بە حەرام ئەژمار دەکرێت و دروست نییە بەکار بهێنرێت. بۆ نموونە: ئەگەر شەربەت یان ماستاو تێکەڵ بە عارەق بوو لەو کاتەدا کۆی ئەو شلەمەنییە تێکەڵە حەرامە و بەکارهێنانی دروست نییە، چونکە مەحاڵە بتوانین حەرام و حەڵاڵەکە لێك جیا بکەینەوە و بەپێی ڕێساکەیش حوکمی حەرامەکە بەسەر حەڵاڵەکەدا زاڵ دەبێت.

لەم حاڵەتەشدا بەدوو مەرج کار بەڕێساکە دەکرێت:

أ- نەتوانین حەرام و حەڵاڵەکە لە یەکتر جیا بکەینەوە، وەك ئەو نموونەیەی پێشتر باسمان کرد، خۆ ئەگەر توانیمان ئەو کات هەر یەکەیان حوکمی خۆیان دەبێت و حوکمی هیچیان بەسەری ئەوی تریان جێبەجێ نابێت.

ب- حەرامەکە بەراورد بەحەڵاڵەکە ڕێژەی زۆر کەم نەبێت، خۆ ئەگەر زۆر کەم بوو ئەو کات ئەژمار ناکرێت و حەڵاڵەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە، بۆ نموونە: بەرمیلێك ئاوی پاك ئەگەر کەمێك پیسی تێکەڵ بوو، ڕەنگ و تام و بۆنی ئاوەکەی نەگۆڕی، ئاوەکە هەر بەپاکی دەمێنێتەوە و پیسییەکە هیچ کاریگەری لەسەری نابێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەت و قسەی هاوەڵانەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێت: {فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ، قَدِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ، وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ، وَقَعَ فِي الْحَرَامِ}.(رواه مسلم). واتە: هەرکەسێك خۆی لە شتی گوماناوی پاراست، ئەوە ئاین و کەرامەتیشی پارێزراوە، هەرکەسیش کەوتە کاری گوماناوییەوە ئەوە کەوتۆتە حەرامەوە.

کەواتە و بەپێی ئەم فەرموودەیە کارە گوماناوییەکان هەمان حوکمی کاری حەرامیان هەیە.

٢- حەسەنی کوڕی عەلی دەڵێت: لە پێغەمبەری خودام ﷺ بیستوە و لەبەر کردوە فەرموویەتی: {دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَالَا يَرِيبُكَ}. (رواه البخاري). واتە: واز لەهەر شتێك بهێنە کە گومان لە دڵتدا دروست دەکات و شتێك بکە کە تەواو لێی دڵنیابیت.

ئەم فەرموودەیەیش دیسانەوە هاوشێوەی فەرموودەی پێشوو فەرمان بەوازهێنان لەهەر کارێك دەکات کە گومان لە دڵی مرۆڤدا دروست دەکات.

٣- پێشەوا عومەر دەڵێت: (تَرَكْنَا تِسْعَةَ أَعْشَارِ الْحَلَالِ مَخَافَةَ الرِّبَا).(رواه عبد الرزاق في المصنف). واتە: ئێمە نۆ لەسەر دەی مامەڵە حەڵاڵەکانیشمان واز لێ دەهێنا لەترسی ئەوەی کە تووشی سوو نەبین.

**نموونە:**

١- ئەگەر دارێك بەشێكی كەوتبووە سنوری حەرەمی مەككە و بەشێكیشی لەدەرەوەی حەرەم بوو، بڕینەوەی حەرامە و دروست نییە.

٢- ئەگەر نێچیرێك بەشێكی لەحەرەمدا بوو وە بەشێكیشی لەدەرەوەی حەرەم بوو، ڕاوكردنی حەرامە.

٣- ئەگەر كەسێك بەمنداڵی شیری ئافرەتێكی گەڕەكەكەیانی خواردبێت و دواتر كە گەورەبوو نەزانێت شیری كام ئافرەتەی خواردووە، ئەو كات كچی هەموو گەڕەكەكەی لەسەر حەرام دەبێت؛ چونكە ئێمە دڵنیاین لەوەی هەندێك لەو كچانە لەسەری حەرامن بەڵام نازانین كامیان بەدیاریكراوی حەرامن تا جیایان بكەینەوە، لەم كاتەدا هەموویان بەحەرام ئەژمار دەكرێن.

٤- بەشداری كردن لە پشكی كۆمپانیایەك كە بەشێك لە كارەكانی حەرامە و دروست نییە حەرامە.

هەموو ئەمانەی باسمان كردن بە پێی ڕێسای (إذا اجتمع الحلال والحرام غلب الحرام). حەرام دەبێت و ڕێگەی پێ نادرێت.

## ڕێسای نۆزدە
## الحكم يبنى على الظاهر

**واتە:** حوکمی هەر شتێك لەسەر ڕووکەشەکەی بونیاد دەنرێت.

**گرنگی:** ئامانج لەم ڕێسایە ئاسانکاری کردنە بۆ ژیانی مرۆڤەکان کە بەپێی ڕووکەشی خەڵك و ڕووداوەکان بڕیار بدەن و خەڵك و شتەکان چۆن دەردەکەون ئاوها وێنا و باسیان بکەن و کەس بەشوێن دیوە شاراوەکانی ژیانی خەڵك و شتە پەنهانەکاندا نەگەڕێت؛ چونکە ئەوەی لەدڵ و دەروونەکاندا هەن تەنها خوای گەورە دەیزانێت و لێی بە ئاگایە و هەر ئەویش دەتوانێت لەبارەیانەوە بڕیار بدات.

ڕێسایەکی شەرعی تری هاوشێوەی ئەم ڕێسایەمان هەیە پێمان دەڵێت: (نحن نحكم بالظواهر والله يتول السرائر). واتە: ئێمە حوکم بە ڕوکەش دەکەین و خوای گەورە خۆی بڕیار لەشتە پەنهان و شاراوەکان دەدات.

بۆ نموونە: کەسێکمان هەیە موسوڵمانە و لە ناسنامەکەی نوسراوە موسوڵمان، ئێمە وەك موسوڵمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین تا ئەو کاتەی خۆی کارێك دەکات کە لەبازنەی باوەڕ دەیباتە دەرەوە یان دەڵێت: موسوڵمان نیم. ئەگەر وای کرد یان وای گوت ئەو کات بەپێی قسەکەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت نەك ڕوکەش و ناسنامەکەی.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و سوننەتەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- هەموو ئەو دەقانە کە فەرمان بە مامەڵەکردن لەگەڵ دووڕووەکان وەك موسوڵمان دەکات؛ چونکە ئەوانە وەك موسوڵمان خۆیان وێنا دەکەن و نیشان دەدەن.

٢- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا﴾. (الإسراء:٨١). واتە: کاری سیخوڕی بەسەر یەکترەوە مەکەن و بەدوای نهێنییەکانی یەکتردا مەگەڕێن.

٣- پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: {إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ}. (رواه البخاري و مسلم).

واتە: من مرۆڤێكی ئاساییم وەكو ئێوە و ئێوەیش كێشە و سكالآكانتان دێننەلای من و لەوانەیە هەندێكتان لەوانی دیكە زمان پاراوتر و قسەزانتر بن و منیش بەپێی ئەوەی گوێم لێی دەبێت بڕیاردەدەم، بۆیە هەركەس زانی كە من حەقی براكەیم پێداوە با وەری نەگرێت؛ چونكە ئەوە پشكێكە لە ئاگر من پێی دەدەم.

٤- لە یەكێك لە غەزاكاندا ئوسامەی كوڕی زەید دەڵێت: هێرشم كردە سەر پیاوێك كە شمشێرەكەم لەسەر بەرز كردەوە گوتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) و دواتر كوشتم، بەڵام بابەتەكە لە دڵمدا بوو بە گرێ، كە گەڕاینەوە بۆ پێغەمبەرم ﷺ گێڕایەوە. پێغەمبەری خودا ﷺ زۆری پێ سەیر بوو، فەرمووی: {أَقَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَقَتَلْتَهُ؟!}. واتە: كەسەكە گوتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) و دواتر كوشتت؟! گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەو لەترسی شمشێرەكە وای گوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {أَفلا شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لَا؟}. (رواه مسلم).
واتە: جا بۆ دڵیت لەت نەكرد تا بزانیت لەترسا وای گوت، یان بە ڕاستی وای گوت؟!.
ئوسامە دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندەی سەركۆنە كردم، ئاواتم دەخواست كەبەر لەوە هەر موسوڵمانیش نەبومایە.

هەموو ئەم دەقانە هاوشێوەی ڕێساكە پێمان دەڵێن كە ئێمە بە ڕووكەش بڕیار لەسەر شتەكان بدەین و قسە لەسەر نییەت و دیوە شاراوەكانی دڵ و دەروونی خەڵكی نەكەین و بڕیاریان لە بارەوە نەدەین.

**نموونە:**

١- بڕیاری دادوەرەكان لە دادگاكاندا لەسەر ڕووكەشی ئەوە دەبێت كە دەیبینن و دەیبیستن و بەڵگەكان پشتڕاستی دەكەنەوە، نەك ئەوەی دەیزانن؛ لەگەڵ بە ئاگا بوون لەوەی كە بڕیاری ئەوان ناوەڕۆكی شتەكان و ڕاستییەكان ناگۆڕێت و خەڵكی دەبێت خۆیان لەوە بە ئاگابن كە بە ناڕەوا مافی یەكتر نەخۆن.

٢- سەرجەم بنەماكانی باوەڕ و كوفر و پەرستشەكان و تاوانەكان و حوكمە شەرعییەكان بە پێی ڕووكەشیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێت و بڕیاریان لەبارەوە دەدرێت.

٣- كەسێك مردوە و لاشەكەی لە مزگەوتە هەر موسوڵمانێك لەوێ بێت دەتوانێت نوێژی لەسەر بكات و پێویست ناكات لێكۆڵینەوە بكات لەوەی كە مردووەكە كەسێكی چۆن

بووە بەچی مردوە؛ چونكە ئێمە لەكۆمەڵگەیەكی ئیسلامیدا دەژین و هەر كەس تەرمەكەی هاتە مزگەوت دیارە موسوڵمانە، بەڵام ئەمە ئەو كەسانە ناگرێتەوە كە مردوەكە دەناسن و دەزانن كەسێكی بێ دین بووە، هەر كەس ئەوەی زانی بۆی نییە نوێژی لەسەر بكات؛ بەڵام كەسێك ئەو وردەكارییانەی نەزانی دروستە نوێژی لەسەر بكات.

٤- هەر كەسێك ڕێی كەوتە هەر مزگەوتێك ئاساییە نوێژ لە پشتی مامۆستای مزگەوتەكەوە بكات هەركەس و هەرچی بێت؛ چونكە بەڕوكەش مامۆستای ئاینییە و موسوڵمانە و ئێمەیش بە ڕووكەش بڕیار دەدەین و مامەڵە دەكەین.

٥- كەسێك بە دەستەواژەی تەڵاق خێزانەكەی تەڵاق دا تەڵاقی كەوتوە ئەگەرچی بشڵێت مەبەستم ئەوە بووە كە تەنها بیترسێنم؛ چونكە وشەی تەڵاق واتەكەی ڕوونە و ئێمەیش بە ڕووكەش مامەڵە دەكەین.

٦- كەسێك شتێك دەدات بەكسێكی تر هەرچی پێ بڵێت لەكاتی پێدانی شتەكەدا بەو پێیە مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت، بۆ نموونە ئەگەر گوتی: پێم فرۆشتیت، یان بەكرێ پێم دایت، یان پێم بەخشیت، یان بەئەمانەت لات بێت، یان قەرز بێت، یان وەقف بێت، یان وەصییەت، هەر یەك لەمانە واتە و شوێنەواری ی خۆی هەیە و بەو پێیە مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

ئەمانە و سەرجەم بابەتە شەرعییەكانی تر شەرع بە ڕووكەش بڕیاریان لەبارەوە دەدات و مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات.

## ڕێسای بیست

## الاجتهاد لا ينقض بمثله

**واتە:** ئیجتیهاد بە ئیجتیهادێکی هاوشێوەی خۆی هەڵناوەشێتەوە.

ئیجتیهاد لە ڕێساکەدا سێ حاڵەت دەگرێتەوە.

١- ئیجتیهادی زانایان بۆ گەیشتن بە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو وشەو دەقانەی کە چەند واتایەك هەڵدەگرن و هیچ بەڵگەیەکی دروستیش بۆ یەکلاکردنەوەی واتاکەیان لەبەردەستدا نییە، بۆ نموونە وشەی ﴿قُرُوءٍ﴾. لەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ﴾. (البقرة: ٢٢٨). واتە: ئافرەتانی تەڵاقدراو ماوەی سێ ﴿قُرُوءٍ﴾. چاوەڕوانی دەکەن تا چارەنووسی هاوسەرگیرییەکەیان یەکلا دەبێتەوە، وشەی ﴿قُرْءٍ﴾. لە زمانی عەرەبیدا بۆ دوو واتا بەکار دێت، حەنەفییەکان دەڵێن بۆ خوێنی سوڕی مانگانەیە، شافیعییەکانش دەڵێن بۆ پاکبوونەوەیە لە خوێنی سووڕی مانگانە، وشەکەیش لەزمانی عەرەبیدا هەردوو بۆچوونەکە هەڵدەگرێت و هەردووکیشیان هەر ئیجتیهادە وهیچ دەقێکیش لەبەردەستدا نییە مەبەستی وردی وشەکە ڕوون بکاتەوە.

٢- ئیجتیهادی دادوەرەکان لە یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی ڕۆژانە دێتە بەردەستیان.

٣- ئیجتیهاد کردنی خەڵکانی ئاسایی لە دۆزینەوەی هەندێك حوکمی شەرعی تایبەت و سنووردار، وەك ئیجتیهادی کەسێکی ئاسایی بۆ دۆزینەوەی قیبلە لە چۆڵەوانییدا.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە دڵنەوایی و جێگیرییەکی باش دەبەخشێتە حوکمە شەرعییەکان و ئەو کەسانەیش کە بەدوویدا دەگەڕێن و ئەوانەیش کە جێبەجێیان دەکەن، بەوەی هەر حوکمێك دەقێکی شەرعی لەسەر نەبوو وە بە ئیجتیهاد حوکمە شەرعییەکەیمان دۆزییەوە و کارمان پێکرد، دواتر ئەگەر بۆمان دەرکەوت کە حوکمی پێشوو هەڵە بووە و گەیشتینە حوکمێکی تر، ئەو کات ئەو زانا یان دادوەرەی حوکمە شەرعییەکەی پێشووی داناوە تاوان بار نابێت، چونکە ئەگەر تاوانبار ببێت ئەو کاتە هیچ کەس زاتی ئەوەی نییە کە ئیجتیهاد بکات، شەرعیش لەگەڵ ئەوەدا نییە کە دەرگای ئیجتیهاد دابخات. ئەو حوکمە تازەیەش حوکمە پێشووەکە و هیچ کام لە لێکەوتەکانی هەڵناوەشێتەوە، تەنها ئەوە نەبێت کە لەمەو

پاش حوكم بە بۆچوونە كۆنەكە ناكرێت و ڕادەگیرێت، گۆڕینی حوكمەكە و قەناعەت پێی لەلایەن هەمان زانا خۆیەوە بێت، یان زانایەكەی ترەوە بێت جیاوازی نییە.

مەرج و ڕێكارە شەرعییەكان: بۆ كارپێكردنی ئەم ڕێسایە پێویستمان بەكۆمەڵێك مەرج و ڕێكاری شەرعی هەیە لەوانە:

١- پێویستە كەسەكە بەتەواوی بەشوێن حوكمە شەرعییەكدا گەڕابێت و تەواو توانای خۆی خستبێتە كار و ماندو بوبێت بەشوێنیدا و هیچ بەڵگەیەكی یەكلاكەرەوەی دەست نەكەوتبێت ئەوجا ئیجتیهاد بكات؛ چونكە خودی وشەی (إجتهاد) لە (بذل الجهد) ە وە هاتووە و بەواتەی هەوڵدان و كۆش كردنی تەواو دێت، نەك (إشتهاء) و ئارەزوكاری.

٢- ڕێساكە تەنها ئەو كەسانە دەگرێتەوە كە لە پێگەی ئیجتیهاددان و ئاگایی تەواویان دەربارەی كۆی زانستە شەرعییەكان هەیە، ئەگەر نا هەر كەس لەخۆیەوە و بە بێ ئاگایی دەربارەی حوكمە شەرعییەكان قسە بكات ئەوە هەم خۆی تاوانبار و گومڕا دەكات هەم خەڵكیش بەلاڕێدا دەبات و گومڕایان دەكات؛ بۆیە پێویستە بزانین كە ڕێساكە ڕەها و گشتگیر نییە و هەموو كەسێك ناگرێتەوە.

٣- نابێت ئیجتیهادەكە پێچەوانەی دەقێكی شەرعی بێت؛ چونكە ڕێسایەكی ترمان هەیە پێمان دەڵێت: (لا إجتهاد في مورد النص). واتە: ئیجتیهاد لەدەقدا ناكرێت.

٤- نابێت ئیجتیهادەكە پێچەوانەی كۆدەنگی زانایان بێت؛ چونكە ڕێسایەكی ترمان هەیە پێمان دەڵێت: (المجمع عليه ليس محلاً للاجتهاد). واتە: هەر بابەتێك كۆدەنگی زانایانی لەسەر بوو ئیجتیهادی تێدا ناكرێت.

٥- نابێت دڵنیا بین لەوەی ئیجتیهادەكە هەڵەیە و هەركات بۆمان دەركەوت ئیجتیهادەكە هەڵەیە بۆ لەمەو پاش كاری پێ ناكرێت و هەڵدەوەشێتەوە؛ چونكە ڕێسایەكی ترمان هەیە دەڵێت: (لا عبرة بالظن البَيِّن خطؤه). واتە: كار بەگومانێك ناكرێت كە دڵنیابووین لەوەی هەڵەیە. جا چ هەڵەكە لە خودی حوكمەكەدا بێت، وەك ئەوەی پێچەوانەی دەقێك بێت كە بە موجتەهیدەكە نەگەیشتوە، یان لە هۆكاری حوكمەكەدا بێت وەك ئەوەی پشتی بەبەڵگەیەكی ساختە یان شاهیدییەكی درۆ بەستبێت، بەڵام وەكو گوتمان ئەم حوكمە بۆ لەمەو دوایە و حوكمی پێشتر هەڵناوەشێتەوە.

**سەرچاوە:** ڕێساكە لە چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ و كۆدەنگی زانایان و بەڵگەی ئاوزییەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: {إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: ئەگەر زانایەك یان دادوەرێك ئیجتیهادی كرد لە دۆزینەوەی حوكمێكی شەرعیدا، ئەگەر حوكمەكەی پێكا ئەوكات خوای گەورە دوو پاداشتی دەداتەوە، پاداشتی ماندوبوونەكەی لەگەڕان بەدوای ڕاستیدا، لەگەڵ پاداشتی دۆزینەوەی حوكمە شەرعییەكەدا، خۆ ئەگەر پاش گەڕان بڕیاری داو هەڵەی كرد، ئەو كات پاداشتی ماندوبوونەكەی لەگەڕان بەشوێن ڕاستییدا وەردەگرێت.

٢- عامری كوڕی ڕەبیعە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جارێكیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەفەر بووین، هەور بەری ئاسمانی گرت و نەمانزانی قیبلە لەكوێوەیە، هەرچۆنێك بێت نوێژمان كرد، دواتر كە هەورەكە ڕۆیی و خۆر دەركەوت، بۆمان دەركەوت كە قیبلەكەمان هەڵەبووە، عەرزی پێغەمبەرمان ﷺ كرد كە نوێژەكەمان هەڵە بووە و قیبلە ئاوها نەبووە كە ئێمە نوێژمان كردوە، خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە كە دەفەرمویێت: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللهِ﴾. (البقرة: ١١٥).واتە: ڕوو بكەنە هەر جێگەیەك ڕووی خوای گەورە لەوێیە. دواتر پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی نەكرد كە نوێژەكەیان بگێڕنەوە و ئیجتیهادەكەی پێشوی هەڵنەوەشاندنەوە.

٣- پێغەمبەر ﷺ سوپایەكی بەڕێكرد بۆ بەنی قورەیظە و پێی فەرموون: {لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ العَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: هیچ كەس نوێژی عەسر نەكات لە بەنی قورەیظە نەبێت، پاشان لە ڕێگە بانگی عەسری لێدان، كۆمەڵێك لە هاوەڵان گوتیان: با نوێژەكانمان بكەین؛ چونكە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو كە پەلە بكەین تا پێش عەسر بگەینە ئەوێ و لەوێ نوێژی عەسر بكەین، بەڵام تازە ئێمە هەر دواكەوتوین، بۆیە با نوێژەكانمان بكەین، كۆمەڵێكی دیكە گوتیان: ئێمە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەبەنی قورەیظە نەبێت نوێژی عەسر ناكەین، پاشان هەندێكیان لە ڕێگە نوێژەكانیان كرد و هەندێكیشیان لەبەنی قورەیظە نوێژەكانیان كرد، كە گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بابەتەكەیان بۆ گێڕایەوە، كارەكەی هەردووكیانی پەسەند كرد و سەركۆنەی كەسی نەكرد، ئەمەیش دانپێدانانە بەڕاستی هەردوو بۆچونەكە ودروستی كارپێكردنیان.

٤- کۆدەنگی هاوەڵان: کە بەپێی ئەو هەموو ڕووداوانەی لێیان دەگێڕنەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زۆر جار هاوەڵان بۆچوونیان دەربارەی پرس و بابەتە شەرعییەکان جیاواز بووە؛ بەڵام هیچ کات بۆچوونی یەکتریان هەڵنەوەشاندۆتەوە و نەسڕیوەتەوە، بۆ نموونە: پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ئەبو بەکر کرایە جێنشین، ئەو پێی وابوو کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وەك یەك مووچەیان بۆ ببڕدرێتەوە، هەرچەندە پێشەوا عومەر لەگەڵ ئەم بۆچونە نەبوو بەڵام دژیشی نەوەستایەوە و لە ژیانی ئەبوبەکردا مووچە بەو شێوەیە دابەش دەکرا، پاش وەفاتی ئەو پێشەوا عومەر بوە جێنشین و سیستەمی مووچی گۆڕی و هەرکەسە و بەپێی پێشینەی موسوڵمانبوونی مووچەی بۆ بڕیەوە، کەسیشیان بۆچوونی ئەوی تریان بەهەڵە لەقەڵەم نەداوە.

٥- ئەو چوار جێنشینەی پێغەمبەر ﷺ (ئەبو بەکر، عومەر، عوسمان، عەلی)، هەریەکە و بەشێوازێکی جیاواز لەوی تر بۆتە جێنشین و دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، شێوازی دەسەڵاتگرتنە دەستی هیچ کامیشییان نەبوەتە بەڵگە لەسەر ئەوی تر و هیچ کامیشیان شێوازی ئەوەی پێش خۆی بەهەڵە ئەژمار نەکردوە.

٦- ئەگەر هەر ئیجتیهادێك بە ئیجتیهادێکی دیکە هەڵبوەشێنینەوە ئەوکات هەموو ئیجتیهادەکان یەکتر هەڵدەوەشێننەوە و هیچ ئیجتیهادێك نامێنێت خەڵك لەسەری بڕوات و حوکمی پێ بکات. ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە تا یەکێك لەو ئیجتیهادانە پشتڕاست بکاتەوە و ئەوانی تر بەتاڵ بکاتەوە، بەڵکو هەموویان هەر ئیجتیهادن و لەیەك ئاست و پێگەدان.

**نموونە:**

١- کەسێك دوو سەتڵ ئاوی دانابوو، سەتڵێکیان ئاوی پاك و ئەوی تریان پیس، بەیانی کە هەڵدەستێت دەست نوێژ بگرێت نازانێك کامەیان پاکە و کامەیان پیسە، پاشان ئیجتیهادی کرد و دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد، دواتر بۆی دەرکەوت کە بە ئاوە پیسەکە دەست نوێژی گرتووە، لەم حاڵەتەدا نوێژەکەی دروستە و پێویست ناکات بیگێڕێتەوە.

٢- لە بابەتی حوکمی شەرعییدا، ئەگەر سوڵتان، خەلیفە، سەرۆك، پەیماننامەیەکی واژۆکرد پاشان مرد، بڕیارەکە وەك خۆی جێبەجێ دەکرێت و کەسی پاش خۆی کە دەچێتە جێگەی ناتوانێت هەڵی بوەشێنێتەوە؛ چونکە ئیجتیهاد بە ئیجتیهاد هەڵناوەشێتەوە.

## ڕێسای بیست ویەک
## العقد شريعة المتعاقدين

**واتە:** گرێبەست یاسا و پێڕەوە بۆ لایەنەکانی گرێبەستەکە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە یەکێکە لەو ڕێسا گرنگانەی کە کارئاسانییەکی تەواو بۆ مرۆڤەکان دەکات لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەست و مامەڵەکانیاندا و ڕێگەیان پێ دەدات کە بەدڵی خۆیان گرێبەستەکانیان ئەنجام بدەن و هەر مەرجێك بە پێویستیان زانی بۆ خۆیانی دابنێن و لایەنی بەرامبەری پێوە پابەند بکەن.

هەر لەم پێناوەشدایە کە ئیسلام جگە لەهەندێك مەرجی سەرەکی و بنەڕەتی، وردەکارییەکانی مامەڵەکانی نێوان مرۆڤەکان و ئەرك و مافەکانی نێوانیانی دیاری نەکردوە و لێگەڕاوە تا مرۆڤەکان خۆیان بەپێی هەل و مەرج و پێداویستی گوزەرانی ژیانی خۆیان و کۆمەڵگەکانیان ئەو مەرجانە دیاری بکەن. خۆ ئەگەر لە هەندێك حاڵەتدا دیاریشی کردبێت، ئەو مافەی داوەتە لایەنەکانی گرێبەستەکە کە بەپێی خواستی خۆیان دەستکاری بکەن و هەمواری بکەنەوە، هەر وەك ڕێسا فیقهییەکە پێمان دەڵێت: **(مقاطع الحقوق عند الشروط)**. واتە: مافەکان لەسەر بنەمای مەرجەکان دروست دەبن و کۆتاییان دێت. وەك چۆن کاتێك مرۆڤ پۆشاکێك دەکڕێت، بۆی هەیە بەدڵی خۆی ڕەنگ و شێوازی دورین و قەبارە و سەرجەم وردەکارییەکانی تری هەڵبژێرێت، گرێبەستەکانیش هەر وان، ئەم نەرمی و فراوانییەیشە وای کردوە کە ئیسلام بتوانێت لەگەڵ هەموو ژیار و شارستانییەتەکان هەڵبکات و گەشە بکات و خواست و پێداویستی سەرجەم مرۆڤەکان دابین بکات.

ڕێسایەکی ترمان هەیە وردتر لەم ڕێسایە و ڕونتر باس لە کرانەوەی شەریعەت و مافی لایەنەکانی گرێبەستەکان دەکات لە دانانی مەرج و دەڵێت: **(الأصل في الشروط الجواز إلا ما دل الشرع على تحريمه)**. واتە: دانانی هەر مەرجێك لە بنەڕەتدا دروستە، جگە لەو مەرجانە نەبێت، کە بەڵگەی شەرعی لەسەر حەرامییان هەیە.

ئەو مەرجانەیش کە لایەنەکانی گرێبەستەکە دایان دەنێن حوکمەکانیان بەپێی سەرچاوەکنیان دەگۆڕێن و بەو پێیەیش دەبن بەچەند بەشێکەوە لەوانە:

١- مەرجە شەرعییەکان: بەهەموو ئەو مەرجانە دەگوترێت کە شەرع دایدەنێت و لایەنەکانی گرێبەستەکە مافی لادان یان گۆڕینیانی نییە، وەك دانانی مەرجی موسوڵمان بوونی پیاو بۆ ئەنجامدانی گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی موسوڵماندا. یان بوونی شایەت لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا.

٢- مەرجە یاساییەکان: بەو مەرجانە دەگوترێت کەسەرچاوەی دانانی بۆ دەقەکانی یاسا دەگەڕێتەوە، وەك دانانی مەرجی تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری لەدادگا بۆ ئەوەی لە ڕووی یاساییەوە کاری پێ بکرێت.

٣- مەرجە داب و نەریتییەکان: بەو مەرجانە دەگوترێت کە هیچ دەقێکی یاسایی یان شەرعی باسی ناکات، بەڵآم لەکلتوری کۆمەڵگادا بوەتە مەرج و بەهەند وەردەگیرێت و کاری پێ دەکرێت، وەك دابەشکردنی مارەی بۆ پێشەکەی و پاشەکی بەپێی نەریتی کۆمەڵگە، یان دیاریکردنی ڕێژەی خەرجی بژێوی ژن لەسەر پیاو بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵگە.

٤- مەرجەکانی لایەنەکانی گرێبەستە: بەو مەرجانە دەگوترێن کەسەرچاوەی دانانی مەرجەکان خواستی لایەنەکانی گرێبەستەکان خۆیانن، وەك ئەوەی ئافرەت لەگرێبەستی هاوسەرگیریدا مەرجی ئەوە دابنێت کە هاوسەرەکی ڕێگەی کاری لێ نەگرێت، یان پیاو مەرجی ئەوە دابنێت کە ئافرەت داوای ماڵی جیا نەکات.

هەموو ئەم مەرجانەیش شەرعیین و کاریان پێ دەکرێت، جگە لەو مەرجانە نەبێت کە پێچەوانەی دەقێکی شەرعین؛ چونکە هەر مەرجێك پێچەوانەی دەقێکی شەرعی بێت دروست نییە و کاری پێ ناکرێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت: {مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، مَنِ اشْتَرَطَ شَرْطًا لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَلَيْسَ لَهُ، وَإِنِ اشْتَرَطَ مِائَةَ مَرَّةٍ}.(صحيح البخاري). واتە: ئەوە چییە خەڵکانێك فێربوون کۆمەڵێك مەرج دادەنێن، کە پێچەوانەی قورئان و فەرمایشتەکانی خوای پەروەردگارن، هەر کەسێك هەر مەرجێك دابنێت پێچەوانەی فەرمایشتێکی خوای گەورە بێت، مەرجەکەی ئەژمار ناکرێت و بەهەند وەرناگیرێت، ئەگەر سەد مەرجیش دابنێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾. (سورة المائدة:١). واتە: ئەی گرۆهی بڕواداران پابەند بن بە مەرج و بەڵێن و گرێبەستەکانتانەوە.

٢- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {المُسْلِمُونَ عِنْدَ شُرُوطِهِمْ}.(صحيح البخاري). واتە: پێویستە موسوڵمانان پابەند بن بە مەرجەکانیانەوە.

٣- ڕێسای (إستصحاب) کە یەکێکە لەسەرچاوەکانی حوکمی شەرعی و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە هەموو مامەڵە و مەرج و داب و نەریتێکی کەسی یان کۆمەڵایەتی دروستە و ڕێگە پێدراوە.

**نموونە:**

١- ژن و پیاو لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیریدا بۆیان هەیە هەر مەرجێك دابنێن کە دەزانن بۆ ژیانی خۆیان گونجاوە، بۆ نموونە: ئافرەتەکە دەتوانێت مەرجی ئەوە لەسەر پیاوەکە دابنێت کەخوێندنەکەی تەواو بکات، یان لە کار و پیشەکەی بەردەوام بێت، یان تەڵاقی بەدەست بێت، پیاوەکەیش دەتوانیت مەرجی ئەوە لەسەر ئافرەتەکە دابنێت، کە داوای ماڵی جیا نەکات، یان واز لە خوێندنەکەی بهێنێت، یان داوای منداڵی لێ نەکات، یان هەر مەرجێکی تر کە خۆیان بۆ ژیانی خۆیان بەپێویستی دازانن، هەموو ئەم مەرجانەیش دروستن و پێویستە لایەنی بەرامبەر پێیانەوە پابەند بێت و ناچێتە خانەی حەڵاڵکردنی حەرام یان حەرامکردنی حەڵاڵەوە؛ چونکە لە بنەڕەتدا ئەو کارانە ڕێگەپێدراون و واجب نین؛ بۆیە ناکرێت ئەو مەرجانە وەك حەرامکردنی حەڵاڵ، یان حەڵاڵکردنی حەرام ئەژمار و تەماشا بکرێن.

٢- موسوڵمانێك مافی هاوڵاتیبوون یان پەنا هەندەیی لەوڵاتێك بیانی وەردەگرێت، پێویستە پابەند بێت بەو مەرجانەی کە لە سەر بنەمای ئەوانە ئەو مافەی پێ دراوە، لەوانە نابێت درۆیان لەگەڵ بکات و لەسەر بنەمای درۆ مافی پەنابەرێتی یان هاوڵاتیبوون بەدەست بێنێت، یان ئارامی و ئاشتی ئەو وڵاتە تێك بدات، یان ئیشی ڕەش بکات؛ پێویستیشە پابەند بێت بەهەموو یاسا و ڕێسایەکیانەوە جگە لە یاسایەك نەبێت کە

پێچەوانەی ئاینی ئیسلام و بەها باڵاکانێتی؛ چونکە ئەم خۆی چۆتە ئەو وڵاتە، ئەوانیش لەسەر ئەو بنەمایە ئەو مافەیان پێداوە و ئەمیش بەڵێنی داوە بە یاسا و ڕێساکانی ئەوانەوە پابەند بێت، هەرچەندە شەرعیبون و نەبونی ئەو دەسەڵاتانە و دەست تێوەردانیان لە جیهانی ئیسلامی و چەوساندنەوەیان بۆ گەلانی موسوڵمان قەسەی خۆی هەیە، بەڵام بۆ ئێمە نا کە لەوێ وەك پەناهەندە و وەك هاوەڵاتی دەژین.

٣- لە کاتی مامەڵە کردندا لایەنەکانی گرێبەستەکە پێویستە پابەند بن بەهەر مەرجێکەوە لەسەری ڕێك دەکەون، لەوانە: جۆر و مواسەفات و بڕ ڕووبەر و کێش و قەبارەی کاڵاکان و وادەی ڕادەست کردنی نرخەکانیان و هەر مەرجێکی تر کە لەسەری ڕێکدەکەون .

ئەمانە نموونەی مەرجە شەرعییەکان بوون، نموونەی مەرجە ناشەرعییەکانیش وەك:

٤- لە کاتی هاوسەرگیریدا پیاو مەرجی ئەوە لەسەر خێزانەکەی دابنێت کە نابێت باڵاپۆش بێت، یان نابێت نوێژ بکات، یان هاتوچۆی ماڵی باوکی بکات، یان ئافرەتەکە ئەو جۆرە مەرجانە لەسەر پیاوەکەی دابنێت، یان بەمەرجی ئەوە شووی پێ بکات کە خێزانی پێشتری تەڵاق بدات، یان نادادپەروەری لەگەڵ بکات.

٥- کەسێك پارە بەکەسێکی تر بدات تا مامەڵەی پێوە بکات و مەرجی ئەوەی لەسەر دابنێت کە دەبێت لە قازانج و زیانیشدا هاوبەش بن، ئەم مەرجە ناشەرعییە و تەنها لە قازانجدا هاوبەش دەبن ئەگەر زیانێك هەبوو تەنها لەپارەکەی ئەو دەکەوێت و بەرامبەرەکەیشی ڕەنج و ماندوبوونەکەی لەدەست دەدات.

٦- هەر مامەڵەیەك مەرجی سووی تێدا بێت شەرعی نییە، وەك ئەوەی کۆمپانیاکانی نیشتەجێبوون یان ئۆتۆمبێل لەکاتی مامەڵەکردن بەگوژمەدا لەسەر کڕیارەکانی دادەنێن، کە ئەگەر دانەوەی گوژمەکان لەکاتی خۆی دوابکەوێت، ئەوان غەرامەی دەکەن و پارەی زیاتری دەخەنە سەر، یان کەسێك پارە بەکسێك بدات و مەرجی قازانجێکی دیاریکراوی لەسەر دابنێت و بڵێت، من مانگی ئەوەندە قازانجم دەوێت، بێ گوێدانە ئەوەی کە ئایا مامەڵەکە قازانجی کردوە یان زیان.

هەموو ئەم مەرجانەو سەدان مەرجی هاوشێوەی ئەمانە لە شەرعدا دروست نین و شەرعی نیین تا لایەنەکانی گرێبەستەکە پێوەی پابەند بن؛ بۆیە پێویستە لە گرێبەستەکاندا لا ببرێن.

هەندێك مەرجی ترمان هەیە حەرامن و دروست نین لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکاندا بە ئاشکرا باس بکرێن؛ بەڵام ئەگەر مەرجەکە تەنها لەدڵی کەسەکە خۆیدا بوو وە کەسی تری لێ ئاگادار نەبوو، وە هیچ زیانێکی بۆ لایەنی بەرامبەر نەبوو، ئەو کات گرێبەستەکە دروستە و هیچ کێشەی نییە، بەڵام ئەگەر زیانی بۆ لایەنی بەرامبەر هەبوو، ئەو کات گرێبەستە دروست نییە و دانامەزرێت و بۆ هەر یەکێ لەوانە نموونەیەك دەهێنینەوە.

٧- هاوسەرگیری (تحلیل) مارە بەجاش حەرامە و دروست نییە؛ چونکە هیچ کام لە مەرج و مەبەستەکانی هاوسەرگیری دروستی تێدا نییە، جگە لە حەڵاڵ کردنەوەی ئافرەتەکە نەبێت بۆ هاوسەری یەکەمی؛ بەڵام ئەگەر حاڵەتێکی وا پێش هات وکەسێك بینی ئافرەتێك سێ جار تەڵاق دراوە و لێی قەوماوە و چوار پێنج منداڵی هەیە و خۆیشی و هاوسەرەکەیشی حەز دەکەن بگەڕێنەوە بۆلای یەکتر، و ئەمەیش ناکرێت تا ئەم ئافرەتە شو نەکات بە کەسێکی ترو ئەویش بچێتە لای و لەگەڵی بمێنێتەوە دوایی تەڵاقی بدات، دوای تەواو بونی ماوەی چاوەڕوانی پاشان بگەڕێتەوە لای مێردی یەکەمی، ئەم کەسە لەدڵی خۆیدا و بەبێ ئەوەی کەس بزانێت یان هەستی پێ بکات و لە بەر خوای گەورە و سەرگەردان نەبوونی ئەو منداڵانە هاوسەرگیرییەکی شەرعی لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بکات بەبێ ئەوەی ئەم نیەتەی ناخی خۆی لای کەس باس بکات و پاش ماوەیەك ژنەکە تەڵاق بدات، تا بگەڕێتەوە لای هاوسەری خۆی، ئەو هاوسەرگیرییە دروستە و هیچ کێشەی نییە؛ چونکە بابەتەکە نەبوەتە مەرج و لەنیەتی دڵ تێپەڕی نەکردوە و نیەتەکەیش لەبەرژەوەندی گشت لایەکدایە.

٨- هاوسەرگیری بە نیەتی تەڵاق و جیابوونەوە، بۆ نموونە: کەسێك دەڕواتە هەندەران بەمەبەستی خوێندن، یان نەخۆشی، یان بازرگانی، یان مافی پەنابەرێتی، یان هەر مەبەستێکی تری کاتی و لەوێ ئافرەتێك داوا دەکات بەو نیەتەی کە کەی کارەکەی تەواو

بوو تەڵاقی بدات، بەڵام ئەم نیەتەی دڵی لای ئافرەتەکە باس ناکات و وای حاڵی دەکات، کە ئەم هاوسەرگیرییەکی هەمیشەیی لەگەڵ دەکات، ئەم کارە حەرامە و دروست نییە و فێڵ و درۆ و دەستبڕینی تێدایە و ئەگەر سەرەتا ئەو مەرجەی باس بکردایە ئافرەتەك ڕازی نەدەبوو وە هاوسەرگیری لەگەڵ نەدەکرد

ئێستا خەڵکانی مسوڵمان لە هەندەران سەرقاڵی ئەو کارەن و لەپێناو وەرگرتنی مافی پەنابەرێتی یان هاوڵاتی بوون ، دەچن دەستی ئەوئافرەتانە دەبڕن و هاوسەرگیرییان لەگەڵ دەکەن و هەر ئەوەندەیش بەمەبەستی خۆیان گەیشتن ئیتر تەڵاقیان دەدەن و دەستیان لێ هەڵ دەگرن، ئەمەیش وای کردوە کە خەڵکانی ئەو وڵاتانە تێڕوانینیان بەرامبەر بە خەڵکانی موسوڵمان زۆر نەرێنی بێت و بەچاوی درۆزن و هەلپەرست تەماشایان بکەن.

هەرچەندە هەندێك لە زانایانی پێشین ڕێگەیان بەم جۆرە هاوسەرگیرییە داوە؛ بەڵام من لە ئێستادا بەحەرامی دەبینم و پێم وایە ئەگەر ئەو زانا بەڕێزانە لە ئێستادا بمانایە هەمان هەڵوێستیان دەبوو؛ چونكە ئەم بابەتیە لەسەردەمی ئەواندا تەنها چەند حاڵەتێکی کەم بووە و نەبۆتە دیاردە، بەڵام لە ئێستادا بۆتە دیاردە و زیانی گەورەی بە ناوبانگی ئیسلام و موسوڵمانان گەیاندوە، هەر بۆیە کۆمکاری فیقهی ئیسلامیش لە ئێستادا ئەو بابەتەیان بە حەرام لەقەڵەم داوە و دەڵێن دروست نییە.

ئەمانە پوختەیەك بوون لە نموونەی ئەو مەرجانەی کە دەکرێت لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکاندا بوونیان هەبێت و قسەیان لەسەر بکرێت.

## ڕێسای بیست و دوو

## الملحق بالعقد يعد واقعا فيه

**واته:** ئەوەی لایەنەکانی گرێبەستەکە لەسەری ڕێك دەکەون پاش ئەنجامدانی گرێبەست، هەمان حوکمی گرێبەستەکەی هەیە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە بەشێکی ترە لەو ئاسانکارییانەی کە شەریعەتی ئیسلامی بۆ خەڵکی دەکات لەکاتی ئەنجامدانی مامەڵە و گرێبەستەکانیاندا، بەوەی ڕێگەیان پێدەدات پاش تەواوبوونی گرێبەستەکانیش و هەر کات ویستیان زیاد و کەم و گۆڕانکاری لە گرێبەستەکانیاندا بکەن و هەر گۆڕانکارییەکیش لایەنەکانی گرێبەستەکە ئارەزومەندانە بڕیاریان لەسەردا و لەسەری ڕێکەوتن، هەمان حوکمی گرێبەستەکەی هەیە لەسەرەتادا.

**سەرچاوە:** ڕوونترین بەڵگە لەسەر شەرعیبوونی ئەم ڕێسایە ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەربارەی مافی هاوسەرەکان لەدەستکاری کردنی ڕێژەی مارەییدا دەفەرموێت: ﴿وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ﴾. (سورة النساء: ٢٤). واتە: پاش دیاریکردنی ڕێژەی مارەیی هەر گۆڕانکارییەکتان تێدا کرد بەڕەزامەندی هەردوو لا هیچ کێشەی نییە و گوناهبار نابن، ئەم ئایەتەیش ڕاستە باسی مارەیی دەکات، بەڵام سەرجەم مامەڵە شەرعییەکانی تریش دەگرێتەوە.

**نموونە:**

١- لە گرێبەستی فرۆشتن یان بەکرێدان یان هەر گرێبەستێکی تردا، لایەنەکانی گرێبەستەکە مافی خۆیانە دەستکاری نرخەکە بکەن و کەم و زیادی تێدا بکەن، یان گۆڕناکاری لە کاڵاکاندا بکەن.

٢- لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا و پاش ئەنجامدانی گرێبەستەکە هاوسەرەکان مافی خۆیانە دەستکاری مەرجی گرێبەستەکانیان بکەن وبەپێی پێویست گۆڕانکاری تێدا بکەن.

٣- لە بابەتی قەرزدا لایەنەکانی گرێبەستەکە هیچ مافێکیان نییە زیادە بخەنە سەر ڕێژەی قەرزەکە با هەردوو لایش ڕازی بن، چونکە ئەو ڕێکەوتنە پێچەوانەی بەڵگە شەرعیەکانە و دەبێتە سوو.

## ڕێسای بیست و سێ

## الوعد لا ينعقد به العقد

**واتە:** بەڵێن جێگەی گرێبەست ناگرێتەوە و حوکمی گرێبەستیشی نییە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە پێمان دەڵێن کە بەڵێنەکان حوکمی گرێبەستیان نییە و شوێنەواری گرێبەستیشیان لەسەر دانامەرزرێت، چونکە بەڵێن و گرێبەست لە چەند ڕوویەکەوە جیاوازن لەوانە:

١- گرێبەستەکان کارێکن لە ئێستادا بڕیاریان لەسەر دەدرێت، بەڵام بەڵێنەکان بۆ پابەند بوونە بەکارێك لە داهاتودا نەك لە ئێستادا.

٢- بەڵێنەکان زۆربەی کات پابەندبوونێکی تاك لایەنەیە و مەرج نییە کەسی بەرامبەر ئامادەی پابەندبوونی بەهەمان بەڵێن تێدا بێت؛ یان هەر ئاگایشی لێی بێت؛ بەڵام گرێبەستەکان هەمیشە دوو لایەنەیە و مەرجیشە کە هەردوو لا ئاگاداری تەواویان هەبێت لە ناوەڕۆکی گرێبەستەکەیان و ئامادەیی تەواویان تێدا بێت بۆ پابەندبوون پێوەی.

٣- بەڵێنەکان ناچنە بواری جێبەجێکردنەوە و هیچ شوێنەوارێکی یاساییشیان لەسەر دروست نابێت تا کاتی جێبەجێکردنیان، بەڵام گرێبەستەکان یەکسەر دادەمەزرێن و دەچنە بواری جێبەجێکردنەوە و شوێنەوارەکانیان لەسەر دروست دەبێت.

٤- ئاساییە بەڵێنەکان بەشتی نادیار بن یان نادیارییان تێدا بێت؛ بەڵام گرێبەستەکان پێویستە ڕوون و ئاشکرا بن و گشت وردەکارییەکانیان زانراو بێت.

٥- پەشیمان بوونەوە لە بەڵێن ئاسانترە لە پەشیمان بوونەوە لە گرێبەست و شوێنەواریشی کەمترە و زۆربەی زانایان پێیان وایە کە ئەگەر کەسێك بەڵێنێکی دا، مافی خۆیەتی جێبەجێی نەکات و ئەو کات ڕاستە گوناهبار دەبێت لەڕووی شەرعییەوە، بەڵام لەڕووی یاساییەوە ناچار ناکرێت بە پابەند بوون بەبەڵێنەکەیەوە.

بۆ نموونە: ئەگەر پیاوێك بەژنێکی گوت پاش شەش مانگی تر دەتهێنم، لەقسەکەیدا دیارە کە ئەو لە ئێستادا ئامادە نییە بیهێنێت، بەڵکو پاش شەش مانگی تر ئامادەیە ئەو کارە بکات، دواتر ئەو بەڵێنەی پیاوەکە تاك لایەنەیە و چاوەڕێی هەڵوێستی ئافرەتەکەی

نەکردوە و ئێمە نازانین کە ئایا ئافرەتەکە بەوە ڕازییە یان نا، یان هەر ئاگای لێیەتی یان نا، وە نە لە ئێستادا کە پیاوەکە قسەکەی کردوە و نە لەدوای شەش مانگی تر کە وادەی جێبەجێکردنی بەڵێنەکەیە گرێبەستی هاوسەرگیری لە نێوانیان دانامەزرێت و هیچ شوێنەوارێکیشی لەسەر دروست نابێت و بنەما لەسەر ئەو بەڵێنە پیاوەکە بۆی نییە سەیری ئەو ئافرەتە بکات، یان لەشوێنی تەنها و پەنهاندا لەگەڵی بمێنێتەوە، وە ئافرەتەکەیش بەو بەڵێنە هیچ مارەیی ناکەوێت و لەو ماوەیەدا هەر کامیان بمرن میرات لەیەکتر نابەن، وە ئەگەر پیاوەکە پاش شەش مانگەکە ئافرەتەکەی نەویست و پەشیمان بویەوە ئاساییە و ئافرەتە بۆی نییە داوای هیچ مافێکی لێ بکات، مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێت کە بەهۆی ئەو بەڵێنەی ئەوەوە زیانێکی لێ کەوتبێت، ئەو کات تەنها بۆی هەیە داوای قەرەبووی زیانەکەی بکاتەوە، نەك ناچارکردنی پیاوەکە بە پابەندبوون بەبەڵێنەکەیەوە.

**سەرچاوە:** لەبەر ئەوەی مەبەستی لایەنەکانی گرێبەستەکان ئەوەیە کە لە ئێستادا کار بەگرێبەستەکەیان بکەن و بیخەنە بواری جێبەجێ کردنەوە و شوێنەوارەکانی لەسەر دروست بێت و بەڵێنەکانیش هیچ کام لەو مەرجانەی تێدا نییە؛ بۆیە بەڵێنەکان بەگرێبەست ئەژمار ناکرێن و هەمان حوکمی ئەویان نییە.

**نموونە:**

١- پیاوێك بە گەنجێکی گوت: ئەگەر کچمان بوو دەتدەمێ، ئەمە تەنها بەڵێنە و گرێبەست نییە و مەرج نییە ئەگەر کچی بوو بیداتێ، بەڵکو بۆی هەیە پابەند نەبێت بەبەڵێنەکەیەوە.

٢- کەسێك بە هاورێکەی گوت ئەگەر خانوەکەم یان سەیارەکم فرۆشت دەیفرۆشم بەتۆ، مەرج نییە کە فرۆشتی بیدات بەم یان تەنانەت ئاگاداریشی بکاتەوە؛ بەڵکو بۆی هەیە بەهەرکەسی ویست بیفرۆشێت.

٣- لە فرۆشتنی دراو بە دراو یان ئاڵتون بەئاڵتون یان زیو بە زیو، مەرجە هەردوو کاڵاکە ئامادەبن ئەگەر نا دەبێتە سوو؛ بەڵام ئەگەر قسەکەیان تەنها بەڵێن بوو بەوەی ئاڵتون یان دراوەکانیان بەیەك بفرۆشن، ئەو کات ئاساییە حەرام نییە، چونکە ئەو بەڵێنە ماڵ نییە لەسەر کەسیان و بەو بەڵێنەیش کەسیان نابنە خاوەنی کاڵای بەرامبەر و بۆیان

نییە هیچ مامەڵەیەکی پێوە بکەن، کەی ویستیان بەڵێنەکەیان بخەنە بواری جێبەجێ کردنەوە و گرێبەست بکەن، ئەو کات پێویستە هەردوو کاڵاکە ئامادە بێت ئەوجا بۆیان هەیە مامەڵەیی پێوە بکەن.

٤- کەسێك سوێن دەخوات کە ژن لە ناوچەیەك نەهێنێت، پاش ماوەیەك بەڵێن بە ئافرەتێکی ئەو شوێنە دەدات کە بیهێنێت، بەم بەڵێنە سوێندەکەی ناکەوێت، کەی گرێبەستی هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، ئەو کات سوێندەکەی بە کەوتو ئەژمار دەکرێت.

٥- پیاوێك هاڕەشەی لە هاوژینەکەی کرد و پێی گوت: تەڵاقت دەدەم، بەم وتەیە تەڵاقی ناکەوێت؛ بەڵام ئەگەر گوتی: تەڵاقم دایت، یان تەڵاقت کەوتبێت، ئەوە تەڵاقی دەکەوێت؛ چونکە قسەی یەکەمیان بەڵێنە بۆ داهاتوو بەڵام ئەوانی تر بڕیارە بۆ ئێستا و ڕابوردو.

٦- لە مامەڵەی (مرابحة) دا، کەسێك بە بانکی گوت، ئەو ئۆتۆمبێلە یان خانوە یان زەویەم بۆ بکڕە، من دواتر بە قیست و بەزیاتر لە تۆی دەکڕمەوە، بنەما لەسەر ئەم بەڵێنە بانك چوو کاڵاکەی کڕی و بۆی هێنا، بەڵام دواتر ئەم گوتی پەشیمان بومەتەوە و نامەوێت، لەم حاڵەتەدا بانك بۆی نییە ئەم ناچار بکات و بڵێت دەبێت هەر بتەوێت و من لەسەر بەڵێنی تۆ کڕیومە، چونکە ئەوەی ئەم گوتویەتی تەنها بەڵێن بووەو بەڵێنیش بەگرێبەست ئەژمار ناکرێت، بەڵام بانك بۆی هەیە لەدەرەنجامی ئەم بەڵێن و مامەڵەیەی ئەم هەر زیانێکی کرد قەرەبووەکەی لەو وەربگرێتەوە.

## ڕێسای بیست و چوار

## العقد يبطل بهلاك المعقود عليه

**واتە:** گرێبەست بەنەمانی کاڵا یان کاری گرێبەست لەسەر کراو هەڵدەوەشێتەوە و پوچەڵ دەبێتەوە.

**گرنگی:** دیارە ئامانجی ئەم ڕێسایە پاراستنی مافی لایەنەکانی گرێبەستەکانە، بەوەی کاتێك کاڵا یان کار، یان سوودە گرێبەست لەسەر کراوەکان تیادەچن و پوچەڵ دەبنەوە، مافی لایەنەکانی گرێبەستەکە پارێزراو بێت؛ چونکە مەبەست و ئامانجی هەر گرێبەستێك کە ئەنجام دەدرێت، ئەو کاڵا یان کار یان سوودەیە کە گرێبەستەکەی لەسەر دامەزراوە، هەر بۆیە بەیەکێك لە بنەماکانی گرێبەستەکە دادەنرێت و ئەژمار دەکرێت و بەنەمان و لەدەستدانیشی ئامانج و مەبەستی گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوە و پوچەڵ دەبێتەوە و واتایەك بۆ ئەنجامدانی نامێنێتەوە و جێبەجێ کردنی دەبێتە مەحاڵ. ئەم حوکمەیش هەموو گرێبەستێك دەگرێتەوە، چ کورت خایەنەکان  وەك کڕین و فرۆشتن و بەخشین، یان درێژ خایەنەکانی وەك بەکرێدان و بریکاری و هاوبەشیبوون.

جا ئەگەر گرێبەستەکە خێراو و کورت خایەن بوو وەك کڕین و فرۆشتن، وە کاڵاکە ڕادەست نەکرابوو، ئەوە بە لەدەستدانی کاڵاکە دەستبەجێ گرێبەستەکە لەبنەڕەتەوە هەڵدەوەشێتەوە و هیچ شوێنەوارێکیشی لەسەر دروست نابێت، بەڵام ئەگەر کاڵاکە ڕادەست کرابوو ئەوە گرێبەستەکە وەك خۆی جێبەجێ دەکرێت، بۆ نموونە: کەسێك ئۆتۆمبێلێکی کڕی و بەر لەوەی خاوەنەکەی ڕادەستی بکات سوتا، ئێستا گرێبەستەکە لە بنەڕەتەوە هەڵدەوەشێتەوە و هیچ شوێنەوارێکی لەسەر دروست نابێت؛ بەڵام ئەگەر پاش ڕادەستکردن ئۆتۆمبێلەکە لای کەسی کڕیار خۆی سووتا، ئەوە پێویستە پابەند بێت بەئەنجامدانی گرێبەستەکەوە و بەهای ئۆتۆمبێلەکە ڕادەستی فرۆشیار بکات.

ئەگەریش گرێبەستەکە درێژ خایەن بوو وەك بەکرێدان، ئەوە تیاچونی گرێبەست لەسەرکراوەکە لە کاتی لەدەستدانییەوە کاری پێ ناکرێت و ڕادەگیرێت؛ بەڵام گرێبەستەکە لە بنەڕەتەوە هەڵناوەشێنێتەوە و لەو ماوەیەی کە گوزەراوە کاری پێ دەکرێت و

شوێنەواریشی لەسەر دروست دەبێت، بۆ نموونە: كەسێك خانویەكی گرتوە بە كرێ بۆ ساڵێك، پاش شەش مانگ خانوەكە سوتا، لەبەرواری سوتانی خانوەكەوە گرێبەستەكە ڕادەگیرێت و كاری پێ ناكرێت؛ بەڵام بۆ شەش مانگی پێشوو كاری پێ دەكرێت و پێویستە كەسی كرێچی كرێی خانوەكە ڕادەستی خاوەنی خانوەكە بكات.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی فەرموودەو كۆدەنگی زانایان و بەڵگەی ئاوەزییەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺدەفەرموێت: {لَوْ بِعْتَ مِنْ أَخِيكَ ثَمَرًا، فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَلَا يَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا، بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقٍّ؟}.(صحيح مسلم). واتە: ئەگەر خورمایەكت بەبراكەت یان هەر كەسێت فرۆشت و بەر لەوەی ڕادەستی بكەیت خورماكە تیاچوو، هیچ پارەی لێ وەرمەگرە، بەچ بیانویەك پارەی بەناحەق لێ وەردەگریت، لە كاتێكدا كە كاڵاكە فەوتاوە و تیا چوە؟!.

٢- زانایان كۆدەنگن لەسەر كاركردن بەم فەرموودەیە و إبن الهمام لەوە بارەیەوە دەڵێت: (بطلان العقد بهلاك المعقود عليه أمر مجمع عليه). (فتح القدير ٩/٢١٠). واتە: هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست بەهۆی تیاچوون و لەدەستدانی كاڵا گرێبەست لەسەر كراوەكە، كۆ دەنگی زانایانی لەسەرە.

٣- ئامانج لە ئەنجامدانی گرێبەستەكە ئەو كاڵا یان سوودەیە كە گرێبەستەكەی لەسەر كراوە و بە لەدەستدانی واتایەك بۆ ئەنجامدانی گرێبەستەكە نامێنێتەوە؛ هەر بۆیە هەڵدەوەشێتەوە.

٤- ئەگەر كاڵاكە یان سوودەكە بمایە، ئەو كات داوای بەهاكەیمان دەكرد، ئێستا كە كاڵا یان سوودەكە نەماوە، چۆن دەكرێت داوای بەها یان بەرامبەرەكەی بكرێت؟! بۆیە لە بنەڕەتدا واتایەك بۆ بوونی گرێبەستەكە نامێنێتەوە.

**نموونە:**

١- ئەگەر كەسێك خانویەكی بەكرێ گرت و بەر لە ڕادەستكردن بە كەسی كرێچی خانوەكە سوتا یان ڕوخا، گرێبەستی بەكرێدانەكە هەڵدەوەشێتەوە و هیچ شوێنەوارێكی لەسەر دروست نابێت.

٢- دوو كەس بڕیار دەدەن كە بە هاوبەشی یەكتر كارێك ئەنجام بدەن؛ بەڵام بەر لە كردنی كارەكە دەستمایە هاوبەشەكەیان سوتا یان دزرا، ئەو كات گرێبەستی هاوبەشییەكەیان هەڵدەوەشێتەوە؛ چونكە سەرچاوەی گرێبەستەكە پارە و دەستمایەكەی نێوانیانە و بەلەناوچونی واتایەك بۆ هاوبەشی بوون نامێنێتەوە.

٣- ئافرەتێكمان بەكرێ گرت بۆ ئەوەی شیرمان بۆ بدات بە منداڵێك، بەر لەوەی شیرەكە بدات ئافرەتەكە مرد، ئێستا گرێبەستی بەكرێ گرتنەكە بەهەڵوەشاوە ئەژمار دەكرێت و هیچ كاری پێ ناكرێت.

## ڕێسای بیست و پێنج

## يبطل العقد ما يمنعه ابتداء

واتە: هەر شتێك سەرەتا ڕێگر بێت لە دروستبوونی گرێبەستێك، ڕێگر دەبێت لەبەردەوامبوونیشی ئەگەر ئەنجام درا.

گرنگی: ئەم ڕێسایە جەخت لەسەر دامەزراوی حوکمە شەرعییەکان و جێگیریی و بەردەوامییان دەکاتەوە و پێمان دەڵێت، هەر شتێك ڕێگر بێت لە نجامدانی گرێبەستێك لەسەرەتادا، ڕێگر دەبێت لە بەردەوامبوونیشی لەداهاتوودا و ڕێسایەکی ترمان هەیە بەشێوەیەکی تر جەخت لەسەر هەمان واتا دەکاتەوە و پێمان دەڵێت: (الشروط تعتبر في الدوام كإعتبارها في الإبتداء). واتە: مەرجەکان چۆن لەسەرەتادا پێویستن و بەهەند وەردەگیرێن، بۆ بەردەوامییش بەهەمان شێوە پێویستن و بەهەند وەردەگیرێن.

هیچ دژایەتییەکیش لە نێوان ئەم دوو ڕێسایە و ڕێسای (يغتفر في الدوام ما لا يغتفر في الإبتداء) - کە بەواتەی ئەوە دێت: ئەوەی لە پێناو بەردەوامی گرێبەستدا چاوپۆشی لێ دەکرێت لەسەرەتادا چاوپۆشی لێ ناکرێت- نییە؛ چونکە ڕێگرە شەرعییەکان لە بنەڕەتدا دەکرێن بەچەند بەشێکەوە لەوانە:

١- هەندێك ڕێگرمان هەیە ڕێگری بنچینەیی و سەرەکین و سەرەتا ڕێگرن لە دامەزراندنی گرێبەستەکان و لە داهاتووشدا و هەر کات دروست بن ڕێگرن لە بەردەوامییان و ئەم جۆرە ڕێگرانەیش بە بەهێزترین جۆرەکانی ڕێگر ئەژمار دەکرێن، بۆ نموونە: ئەگەر کچ و کوڕێك شیری یەك ئافرەتیان خواردبوو، دروست نییە هاوسەرگیری لەگەڵ یەکتر بکەن، خۆ ئەگەریش سەرەتا نەمانزانی و هاوسەرگیریان کرد و پاش ماوەیەك بۆمان دەرکەوت شیریان پێکەوە خواردوە، ئەو کات هاوسەرگیرییەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، ئەگەر بیست ساڵیشی بەسەردا چووبێت.

٢- هەندێك ڕێگرمان هەیە لەسەرەتادا ڕێگرە لە دروستبوونی گرێبەست و مامەڵەکان، بەڵام ڕێگر نییە لە بەردەوام بوون و مانەوەیان، وەك: پۆشینی ئیحرام بۆ حەج، کەسێك کە ئیحرامی حەجی لەبەردا بێت پیاو بێت یان ئافرەت، بۆی نییە گرێبەستی هاوسەرگیری

ئەنجام بدات، نە بۆ خۆی نە بۆ هیچ کەسی تر، بەڵام ئەگەر هاوسەرگیری کردبوو دواتر ئیحرامی بەست، ئەو کات ئیحرامەکەی ڕێگر نییە لەبەردەوامبوونی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەی و گرێبەستەکەی هەڵناوەشێتەوە.

٣- هەندێك ڕێگری ترمان هەیە ڕێگرن لەبەردەوامی گرێبەستەکان، بەڵام ڕێگر نین لە دەستپێکردنیان، وەك: بابەتی تەڵاق سەرەتای دامەزراندنی گرێبەستی هاوسەرگیری وەك مافێکی پیاو بوونی هەیە؛ بەڵام ڕێگر نییە لە دامەزراندنی گرێبەستەکان؛ خۆ ئەگەر دواتر دروست بوو و پیاوەکە بەکاری هێنا، ئەو کات دەبێتە ڕێگر لەبەردەوامی گرێبەستەکە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە هەندێك بەڵگەی ئاوەزییەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە: ئێمە بۆ دروست بوونی هەر حوکمێکی شەرعی پێویستمان بەدڵنیا بوون لە سێ شت هەیە، ئەوانیش: بوونی هۆکارەکان و مەرجەکانە، لەگەڵ نەبوونی ڕێگرەکان، وە هەر کات یەکێ لەمانە کێشەی تێکەوت، کێشە بۆ خودی گرێبەستەکان دروست دەکات و لا سەنگی دەکات یان هەر نایهێڵێت؛ بۆیە ناکرێت لە کاتی بوونی ڕێگرەکاندا ڕێگە بە درستبوونی گرێبەستەکان بدەین، خۆ ئەگەر وامان کرد، ئەو کات هیچ واتا و سەنگێك بۆ بوونی ڕێگرەکان نامێنێتەوە.

**نموونە:**

١- شوکردنی ئافرەتێکی بڕوادار بە پیاوێکی بێ باوەڕ، هەر ئاین و ئایدیایەکەی هەبێت، دروست نییە و حەرامە. ئەگەریش سەرەتا پیاوەکە بڕوادار بوو، بەڵام دواتر و پاش بیست ساڵ دینی گۆڕی، هەمان حوکمی بیست ساڵ لەمەو پێشی هەیە و گرێبەستەکەی نێوانیان هەڵدەوەشێتەوە. چونکە لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا (قوامة) کە بەواتای بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی دێت بەدەست پیاوە، و ئیسلامیش ڕێگە نادات بەوەی بێ باوەڕێك ببێتە سەرپەرشتیار و باڵادەستی بڕوادارێك. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾. (سورة النساء: ١٤١). واتە: خوای گەورە ڕێگە بە باڵادەست بوونی بێ باوەڕان بەسەر بڕواداراندا نادات. جگە لەوەیش ئێمە لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا مەرجێکمان هەیە پێی دەگوترێت مەرجی هاوشانی بوون و بەپێی ئەو مەرجە پێویستە

هەمیشە پیاوان هاوشانی ئافرەتان بن و لەو ڕوەیشەوە هیچ کات پیاوێکی بێ باوەڕ بە هاوشانی ئافرەتێکی بڕوادار ئەژمار ناکرێت.

٢- لە گرێبەستی بریکار گرتە (وكالة) دا ئەگەر بریکار یان کەسی یەکەم شێت بوو، گرێبەستی بریکارییەکە دانامەزرێت و دروست نابێت، خۆ ئەگەریش سەرەتا ژیر بوون و هیچ کێشەیان نەبوو؛ بەڵام دوای ئەنجامدانی گرێبەستەکەیش یەکێکیان شێت بوون، دیسان گرێبەستەکەیان هەڵدەوەشێتەوە و کاری پێ ناکرێت.

٣- ئەگەر ئافرەتێکی مەسیحی لەگەڵ پیاوێکی مەسیحی هاوسەرگیرییان کرد و دواتر ئافرەتەك مسوڵمان بوو، پێویستە پیاوەکەیش موسوڵمان بێت، یان گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەیان هەڵبوەشێتەوە؛ چونکە چۆن موسوڵمانبوونی ئافرەتەکە لەسەرەتادا ڕێگرە لە هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ پیاوێکی مەسیحی، بەهەمان شێوە موسوڵمانبوونی لە دواییشدا ڕێگرە لەبەردەوامبوونی پرۆسەکە لەگەڵ پیاوێکی مەسیحی.

٤- ئەگەر دوو کەسی مەسیحی بازرگانی عارەقیان دەکرد لەگەڵ یەکتر، دواتر یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەستەکە مسوڵمان بوو، گرێبەستی مامەڵەکردنیان بە عارەقەکە هەڵدەوەشێتەوە؛ چونکە ئەگەر سەرەتا کەسەکە مسوڵمان بوایە بۆی نەبوو مامەڵە بە عارەقەوە بکات، بۆیە ئەگەر دواتریش موسوڵمان بوو، دیسان بۆی نییە ئەو مامەڵەیە بکات و گرێبەستەکەیان هەڵدەوەشێتەوە.

## ڕێسای بیست و شەش

## العبرة في العقود للمقاصد والمعاني لا للألفاظ والمباني

**واتە:** گرنگ لە گرێبەست و مامەڵەکان ناوەڕۆك و مەبەستەکانیانە، نەك دەستەواژە و گوزارشتەکان. جگە لەم ڕێسایە ڕێسایەکی کەمان هەیە هەمان واتای هەیە و دەڵێت: (العبرة بالمسميات لا بالأسماء). واتە: گرنگ ناوەڕۆکە نەك ناو.

**گرنگی:** گرنگی ئەم ڕێسایە لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەم: ئەم ڕێسایە کار لەسەر جێگیری حوکمە شەرعییەکان دەکات و پێمان دەڵێت گۆڕینی ناو هیچ کاریگەریی لەسەر گۆڕینی ناوەڕۆك دروست ناکات و مرۆڤەکان بۆیان هەیە هەر ناوێك لەکاڵا و مامەڵە و گرێبەستەکانیان بنێن کە خۆیان دەیانەوێت؛ بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوە بن کە گۆڕینی ناوەکان حوکمی ناوەڕۆکی شتەکان ناگۆڕێت و حوکمە شەرعییەکان پەیوەستن بە ناوەڕۆکی کاڵاکانەوە نەك ناوەکانیان. بۆ نموونە: ئەگەر عارەق ناو نرا بە خواردنەوە ڕۆحییەکان، یان سوو بەڕسومات و سوود، یان درۆ بە سیاسەت، هیچ کام لەم ناوە بریقەدارانە حوکمی ناوەڕۆکی بەدی ئەو شتانە ناگۆڕێت و تا قیامەت هەر حەرامن، ئەگەریش سەد جار ناوەکانیان بگۆڕدرێت.

دووەم: دیارە هیچ کارێکی مرۆڤ بێ مەبەست نییە و ئەو مەبەستانەیش دەبنە بنەمای گشت گرێبەست و مامەڵەکانی مرۆڤ، بۆ گوزارشت کردن لەو مەبەست و خواستانەیش کە لەپشت ئەو کردەوە و مامەڵانەوەن، مرۆڤ هەمیشە وشەو دەستەواژەی تایبەت دادەنێت و بەکار دەهێنێت و حاڵەتی سروشتیش وایە کە مرۆڤ بۆ هەر کارێکی دەستەواژەی تایبەت بەو کارەی بەکار بهێنێت کە دەقاودەق گوزارشت لە مەبەست و خواستەکانی دەکات، خۆ ئەگەر وابو ئەو کات گوزارشت و مەبەستەکان هاوتا دەبن و وەك خۆیان کاریان پێ دەکرێت و هیچ کێشەیان نییە، بەڵام ئەگەر گوزارشت و دەستەواژەکان لەجێی خۆیان بەکار نەهاتن و لەگەڵ مەبەستەکان جیاواز بوون، لەو کاتانەدا و لەپێناو یەکلاکردنەوەی زۆرێك لە کێشەکان و ڕاستاندنی زۆرێك لە گرێبەستەکان کار بەمەبەست و ئامانجەکان دەکرێن، نەك گوزارشت و دەستەواژەکان. بۆنموونە: ئەگەر لە گرێبەستی

هاوسەرگیریدا ئافرەتەکە بە پیاوەکەی گوت: خۆم پێ بەخشیت، یان لەسەر تاپۆ کردیت، حوکمی گرێبەستەکە هەر بەهاوسەرگیریی دەمێنێتەوە و هەر وایش مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و قسەی ئافرەتەکە نایگۆڕێت بە بەخشین یان مامەڵەی کڕین و فرۆشتن؛ چونکە ناوەڕۆکی گرێبەستەکە دیارە کە هاوسەرگیرییە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لەو بەڵگە ئاوەزییەوە سەرچاوەی گرتوە کە پێمان دەڵێت حوکمە شەرعییەکان پەیوەستن بە ناوەڕۆکی شتەکانەوە نەك ناوەکانیان و تەنها گۆڕینی ناو هیچ کاریگەری لەسەر گۆڕینی حوکمەکانیان دروست ناکات و مرۆڤەکانیش ئازادن لە دانانی ناو بۆ هەر کالاّ و گرێبەست و مامەڵەیەك کە خۆیان دایدەهێنن و ناوی شەرعی نییە، و لەکاتی ئەنجامدانی هەر کارو مامەڵە و گرێبەستێکدا ناوەڕۆکەکانیان بەهەند وەردەگیرێت، نەك ناوەکانیان.

**نموونە:**

١- ئەگەر کڕیار و فرۆشیار ڕێکەوتن لەسەر نرخی کالاّیەك و دواتر فرۆشیارەکە بە کڕیارەکەی گوت، پێم بەخشیت، ئەم مامەڵەیە هەر کڕین و فرۆشتنە و بەو قسەیە نابێت بەبەخشین؛ چونکە پێشتر مامەڵەیان کردوە.

٢- ئەگەر فرۆشیار گوتی: (١٠٠٠) دۆلارم بدەرێ و (١٠) تەن گەنمم پێ فرۆشتی بۆ شەش مانگی تر، ئەم مامەڵەیە دەبێتە سەلەم و بەو پێودانگە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، نەك وەك کڕین و فرۆشتنێکی ئاسایی.

٣- ڕەهن لەشەرعدا بۆ دڵنیاکردنەوەی خاوەن قەرزە کە قەرزەکەی نافەوتێ، هەر بۆیە خاوەن قەرز بۆی نییە هیچ سوودێك لە کالاّ ڕەهنکراوەکە ببینێت، خۆ ئەگەر بینی ئەو کات دەبێتە سوو نەك ڕەهن، ماوەیەك خەڵكانێك فێر ببون بەناوی ڕەهنەوە قەرزیان دەدا بەخەڵك و دواتر خانویەك یان دوکانێکیان بە نرخێکی زۆر لاوەکی لە قەرزارەکە وەردەگرت و بۆ خۆیان بەکار دەهێنا تا ئەو کاتەی قەرزەکەیان وەردەگرتەوە، ئەم مامەڵەیە سوویەکی ئاشکرا بوو لە ژێر ناوی ڕەهندا دەکرا؛ بەلاّم خۆ گۆڕینی ناو حوکمی ناوەڕۆك ناگۆڕێت

٣- کەسێك پارەی دا بەکەسێك و پێی گوت: مامەڵەی پێوە بکە و لەزەرەرو قازانجدا هاوبەش دەبین، مامەڵەکە دەبێتە (مضاربة) و ئەو کەسەی کار بەپارەکەوە دەکات تەنها لە قازانجدا هاوبەش دەبێت و هەر زەرەرێکیان کرد، نها لە پارەی خاوەن دەستمایە دەکەوێت. خۆ ئەگەر پێی گوت قازانج و زەرەری بۆ خۆت، ئەو کات دەبێتە قەرز و لەهاوبەشی بوون دەردەچێت.

٤- قەواڵەی دارایی (سندات) و کۆمپیالە هەمان حوکمی پارە و قەرزیان هەیە و بەو پێودانگەیش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، با لە ئێستادا ناوەکانیشیان گۆڕا بێت.

## ڕێسای بیست و حەوت

## إعمال الكلام أولى من إهماله

**واتە:** ئەگەر کەسێك قسەیەکی کرد، تا بتوانین کار بە واتە و لێکەوتەکانی قسەکەی دەکەین و پشتگوێی ناخەین؛ مەگەر قسەکە بە هیچ بارێکدا واتای نەبێت، ئەوکات ناچار پشتگوێی دەخەین و کاری پێ ناکەین.

**گرنگی:** خوای گەورە توانای قسەکردن و بینین و بیستن و تێگەیشتنی بەخشیوە بە مرۆڤەکان، تا بتوانن لە ڕێگەی ئەو هەستەوەرانەوە گوزارشت لە خواستەکانی ناخیان بکەن و دەریان ببڕن، قسە و دەستەواژەکانیش بەهێزترین ئامرازی گوزارشتکردنن لەو خواستانە و هەر یەك لەو دەستەواژانەیش واتای خۆیان هەیە و هەر وشەیەك واتای نەبێت بەهایشی نابێت و کاری پێ ناکرێت، بەهەند وەرگرتن و ئەژمارکردنی ئەو قسانەی مرۆڤ چەمکێکی ترە لە گرنگیدانی شەریعەت پێیان و و مەبەست لێی ڕاهێنانیانە لەسەر ئەوەی کە ژیرانە و با ئاگاییەوە قسە و هەڵسوکەوتەکانیان بکەن و بزانن کەهەرچی دەیڵێن و دەیکەن بۆ دونیا و بۆ قیامەتیش ماڵە لەسەریان و بەپێی ئەو گوفتار و ڕەفتارانەی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، جا ئەگەر واتەی قسەکانیان خۆی ڕوون و ئاشکرابوو وە یەك واتای هەبوو ئەو کات ڕاستەوخۆ کاری پێ دەکەین و بەشوێن مەبەستی خاوەنەکەیدا ناڕۆین، خۆ ئەگەریش واتای قسەکە ڕوون نەبوو، یان چەند واتایەکی هەبوو ئەو کات دەگەڕێینەوە بۆ مەبەستی خاوەنەکەی تا پێمان بڵێت مەبەستی قسەکەی کام واتایە بووە.

**ئەگەر و شێوازەکان:** زانایان کۆمەڵێك مەرجیان داناوە بۆ کارکردن بە ڕێساکە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئەگەر قسەکە دوو واتای هەبوو، دانەیەکیان واتەی ڕاستەقینەی وشەکە خۆی بوو واتە (حەقیقی) بوو ئەوی تر واتایەکی خوازراوبوو واتە (مەجازی) بوو، ئەو کات هەتا بکرێت کار بەواتا ڕاستەقینەکەی دەکرێت و ناڕۆین بۆ واتا مەجازییەکەی. ئەگەر هەر نەدەکرا واتا ڕاستەقینەکەی مەبەست بووبێت، ئەو کات کار بە واتا خوازراوەکەی دەکەین، بۆ نموونە: وشەی شێر لە ڕاستیدا بۆ ئاژەڵێکی دیاریکراو بەکار دێت و هەندێك جاریش بە

خواستن بۆ مرۆڤێكی بە جەرگ و ئازا بەكار دێت؛ بۆیە كاتێك كەسێك دەڵێت: شێرێكم بینیی ئێمە وای ڕاڤە دەكەین كە شێرێكی ڕاستەقینەی بینیوە، بەڵام ئەگەر گوتی: شێرێكم لە زانكۆ یان بازاڕ بینی، ئەو كات دیارە مرۆڤێكی ئازاو بەجەرگی بینیوە؛ چونكە شێر لە بازاڕ و زانكۆ نییە.

٢- ئەگەر قسەیەكی كرد دوو ئەگەری هەبوو: یەكێكیان دووبارەكردنەوە و جەخت كردنەوە لەسەر قسەیەكی پێشووی بێت، ئەوی تریان: قسەیەكی نوێ و هەڵوێستێكی تازە بێت، ئەو كات ئەگەری دووەمیان وەردەگرین و كار پێ دەكەین، كە قسەكە تازەیە؛ چونكە دووبارەكردنەوەی قسەی پێشووی هیچ واتایەكی نییە و وەك پشتگوێ خستن وایە و ئەوەیش پێچەوانەی ڕێساكەیە. بۆ نموونە: پیاوێك بە هاوسەرەكەی دەڵێت تەلاقت كەوتبێت، پاش كەمێكی تر دیسان دەڵێت تەلاقت كەوتبێت، دوو تەلاقی دەكەوێت، و تەلاقە نوێكەی بە جیا بۆ ئەژمار دەكرێت نەك وەك جەخت كردنەوە لەسەر تەلاقی پێشوی.

٣- ئەگەر قسەكە لەوەڵامی پرسیارێكدابوو كە بەسەربەخۆیی وبەبێ بەستنەوەی بە پرسیارەكەوە هیچ واتا نەدات، وەك وشەكانی : (بەڵێ، نەخێر) ئەو كات بەپێی پرسیارەكە مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت و پشتگوێ ناخرێت. بۆ نموونە: كەسێك لەكەسێكی پرسی: ئەڵێن خێزانەكەت تەلاق داوە؟. ئەویش لەوەڵامدا گوتی: بەڵێ. ئەوە ئەگەر پێشتر تەلاقی دابوو، دیارە قسەكەی باسی ئەو تەلاقەیە و تەلاقی تری پێ ناكەوێت؛ بەڵام ئەگەر پێشتر تەلاقی نەدابوو، ئەوە كە گوتی بەڵێ، ئەو كات یەكسەر تەلاقی دەكەوێت و وەك ئەوە وایە گوتبێتی: بەڵێ خێزانم تەلاق داوە، پێشتریش هیچ تەلاقێك نییە، كەواتە لە ئێستادا تەلاقی دەكەوێت و كار بەقسەكەی دەكرێت و پشتگوێ ناخرێت.

٤- ئەگەر قسەكە ڕەها و گشتگیر بوو، ئەو كات بە ڕەهایی وەردەگیرێت و سنووردار ناكرێت؛ چونكە سنوورداركردنی واتا پشتگوێ خستنی بەشێك لەقسەكە و ئەویش بەبێ بەڵگە ناكرێت. بۆ نموونە: كەسێك دەڵێت: تەلاقی خێزانەكانم كەوتبێت، ئەو كات چەند خێزانی هەبێت تەڵاقی هەموویان دەكەوێت نەك تەنها دانەیەكیان، بەڵام ئەگەر گوتی: تەڵاقم كەوتبێت، ئەو كات تەنها تەڵاقی یەك خێزانی دەكەوێت.

٥- ئەگەر قسەکە دوو ئەگەری هەبوو، یەکێکیان بەمەبەست کرابێت و کەسەکە بەڕاستی گوتبێتی، ئەوی تریان بەسوعبەت و گاڵتەی کردبێت، ئەوکات مەبەستە ڕاستەکەی لێوەردەگرین؛ چونکە بەگاڵتە وەرگرتنی واتای پشتگوێ خستن و کار پێنەکردنێتی و ئەوەیش دیسان پێچەوانەی ڕێساکەیە. بۆ نموونە: کەسێك بەکەسێکی گوت: سەیارەکەم پێ فرۆشتیت بەوەندە یان پێم بەخشیت، ئەویش قبوڵی کرد، دواتر ناتوانێت پەشیمان بێتەوە و بڵێت گاڵتەم کرد، بە تایبەتی لە وشەکانی: (هاوسەرگیری، تەڵاق، گێڕانەوەی پاش تەڵاق). چونکە ئەوانە دەقی تایبەتیان لەسەرە و پێغەمبەری خودا ﷺ لەبارەیانەوە دەفەرموێت: {ثلاث جدُّهنَّ جَدٌّ وهَزْلُهُنَّ جدٌّ: النكَاحُ، والطَلَاقُ، والرَّجْعَة}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: سێ وشە بەڕاست بگوترێن هەر ڕاستە و بە گاڵتەیشەوە بگوترێت هە ڕاستە: هاوسەرگیری، تەڵاق، گێڕانەوەی پاش تەڵاق؛ بۆیە ئەگەر کەسێك بەگاڵتەیشەوە بە خێزانی بڵێت تەڵاقت کەوتبێت تەڵاقی دەکەوێت، یان بۆ شانۆ و لە درامایەکدا پێی گوتبێت، یان بۆ ڕاییی کردنی مامەڵەیەك گوتبێی یان نووسیبێتی یان دانی پێدا نابێت و پێی ڕازی بووبێت، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا تەڵاقی دەکەوێت و هیچ کام لەو پاساوانەی لێ وەرناگیرێت بۆ نەکەوتنی تەڵاقەکە.

**سەرچاوە:** ڕێساکە لە چەندین دەقی قورئان و بەڵگەی ئاوەزی و لۆژیکییەوە سەرچاوەی گرتوە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾. (ق: ١٨).واتە: هیچ وشەیەك بەزاری مرۆڤدا نایەت ئیللا فریشتەیەك لەگەڵی ئامادەیە و دەستبەجێ لەسەری تۆمار دەکات و سزا و پاداشتی لەسەر وەردەگرێت.

٢- قسە و هەڵوێستی مرۆڤەکان خۆیان بنەمای سەرەکی دروستبوونی ئەرك و مافەکانی نێوانیانە و پشتگوێ خستنی ئەو قسەو هەڵوێستانە سەر دەکێشێت بۆ لەناوچوونی ئەرك و مافەکانیان و ئەوەیش لەگەڵ دادوەری شەرع ویاسادا یەك ناکاتەوە.

٣- هەر وشە و دەستەواژەیەك کە مرۆڤەکان لە نێوان خۆیاندا بەکاری دەهێنن واتای دیاریکراوی خۆی هەیە، بۆ نموونە وشەکانی: فرۆشتن، کڕین، بەخشین، بەکرێدان، قەرز،

سوو، هاوسەرگیری، تەلاق، مارەیی، هتد و بۆ ئەو مەبەستە بەکاردێن کە بۆی دانراوە و بەو شێوەیەیش مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، خۆ ئەگەر وا نەکەین ئەو کات هەرچی شەریعەت و یاسا و ڕێسا و گرێبەست و بەڵێن و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان هەیە هەڵدەوەشێتەوە.

**نموونە:**

١- کەسێك نەزری کرد نیو ڕۆژ بەڕۆژو بێت، لە شەرعیشدا نیوڕۆژ ڕۆژو بوونی نییە، کەواتە دەبێت ڕۆژێکی تەواو بەڕۆژو بێت؛ بۆ ئەوەی قسەکەی کاری پێ بکرێت و پشتگوێ نەخرێت، ئەگەر وا نەکەین قسەکەی هەڵدەوەشێتەوە و ئەوەیش پێچەوانەی ڕێساکەیە.

٢- کەسێك گوتی ئەم خانوەم وەقف بێت لەسەر منداڵەکانم، دواتر بۆمان دەرکەوت هیچ منداڵی خۆی لە ژیاندا نەماون؛ بەڵام منداڵی منداڵەکانی ماون، ئەو کات وەقفەکەی بۆ منداڵی منداڵەکانی دەبێت؛ چونکە لەڕووی زمانەوانییەوە منداڵی منداڵ هەمان حوکمی منداڵیان هەیە لەزۆر ڕووەوە و ئەگەر وا نەکەین ئەو کات قسەی کەسەکە پشتگوێ دەخرێت و حوکمەکەی هەڵدەوەشێتەوە و ئەوەیش پێچەوانەی ڕێساکە و مەبەستەکانی شەرعە.

٣- کەسێك سوێندی خوارد کە لەو دارە ناخوات، دواتر ئەگەر لەبەری دارەکەی خوارد یان سرکەکەی یان دۆشاوەکەی یان گەڵاکەی یان ڕەگەکەی، سوێندەکەی دەکەوێت؛ چونکە هەمووومان دەزانین کەمەبەستی کەسەکە لەسوێندەکەی خواردنی خودی دارەکە و قەدەکەی نییە چونکە ناخورێت، کەواتە مەبەستی میوە و بەرهەمەکانی بووە، هەروەك ئەوەی کەسێك سوێند بخوات کە لەو مەنجەڵە نەخوات ئێمە دەزانین مەبەستی خودی مەنجەڵەکە نییە بەڵکو ئەوەی ناوێتی؛ بۆیە هەرچی تێدا بێت و لێی بخوات سوێندەکەی دەشکێت، و بەم شێوەیەیش قسەکەی واتای شەرعی دەبێت و پشتگوێ ناخرێت.

٤- کەسێك بەکەسێکی گوت: هەزار دینارم لاتە، ئەویش گوتی: بەڵێ. بەو وشەیە قەرزەکە لەسەری دەبێت بەماڵ؛ هەرچەندە قسەکەی بەتەنها هیچ واتایەکی نییە؛ بەڵام چونکە لەوەڵامی قسەکەی ئەودایە ئەو کات وا ئەژمار دەکرێت کە پشتڕاستی قسەکەی ئەوی کردۆتەوە و بەوەیش قسەکە کاری پێ دەکرێت و پشتگوێ ناخرێت.

**هەڵاوێردەکان:** بەدەر لەو حاڵەتانەی باسمان کرد ئەگەر قسەکە بەهیچ شێوەیەك ڕێی تێ نەدەچوو کە ڕاست بێت، نە بە واتا ڕاستەقینەکەی نە بەواتا خوازراوەکەی، نە لەڕێی شەرعی و نە لەڕێی لۆژیکی و ئاوەزییەوە ئەو کات پشتگوێ دەخرێت و کاری پێ ناکرێت و هیچ حوکمێکی لەسەر بونیاد نانرێت، وەك لەم حاڵەتانەدا:

١- کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە ماسی لە ئاودا یان باڵندەی لەهەوادا بەکەسێکی تر فرۆشتووە، ئەم قسەیە لە ڕووی شەرعییەوە ڕێگەی تێ ناچێت و کاری پێ ناکرێت؛ چونکە ئەو جۆرە کرین و فرۆشتنە لە ڕووی شەرعییەوە ڕێگە پێدراو نییە.

٢- کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات کە باوکی کەسێکی هاوتەمەنی خۆی یان لەخۆی منداڵترە، ئەم قسەیە کاری پێ ناکرێت؛ چونکە نەلەڕێی شەرعی نە یاسایی نە لۆژیکییەوە ڕێگەی تێ ناچێت.

٣- کەسێك قسەیەك بکات دوو ئەگەر هەڵبگرێت و هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نەبێت کە یەکێك لە ئەگەرەکان پشتڕاست بکاتەوە، بۆ نموونە: کەسێك بڵێت: یەکێك لەو دوو ئۆتۆمبێلەم پێ فرۆشتیت، یان یەکێك لەو دوو کچەم لێ مارە کردیت، ئەم قسانە هیچییان کاریان پێ ناکرێت؛ چونکە دیار نییە گرێبەستەکە لەسەر کامیان کراوە و ئەو نادیارییەیش گرێبەستەکە هەڵدەوەشێنێتەوە.

## ڕێسای بیست و هەشت

## الحقوق إذا تقررت لأربابها لا تسقط إلا بالأداء أو الإبراء

**واتە:** هەر مافێك یەکلا بووەوە بۆ خاوەنەکەی، یان دەبێت بۆی بگەڕێتەوە، یان دەبێت خۆی دەستی لێ هەڵبگرێت و گەردنی بەرامبەرەکەی لێ ئازاد کات.

**گرنگی:** مەبەست لەم ڕێسایە پاراستنی مافی خاوەن مافەکانە و جەخت کردنەوەیە لەسەر مانەوە و نەفەوتاندنیان بەهیچ شێوەیەك، جا ئەو مافانە هی خوای گەورە بن یان هی خەڵکی جیاوازی نییە و وەك یەك وایە، تەنها ئەو خاڵە نەبێت کەمافی خوا هیچ سازشی لەسەر ناکرێت و ئەگەری لاچوونی نییە؛ بەڵام مافی خەڵکی ئەگەری سازش و گۆڕین و گەردن ئازادیشی هەیە.

ڕێساکە پێمان دەڵێت سێ ڕێگا هەیە بۆ لاچوونی ماف:

١- گێڕانەوەی مافەکە بۆ خاوەنەکەی وەکو خۆی، خۆ ئەگەر فەوتا بوو هاوشێوەکەی، ئەگەر نەبوو پێویستە نرخەکەی بگەڕێنێتەوە.

٢- خاوەنی مافەکە خۆی گەردنی ئازاد بکات، بەمەرجێك مافەکە لەو مافانە بێت کە گەردن ئازادی بیگرێتەوە، وەك دزی و غەیبەت بەڵام زینا ناکرێت گەردن ئازادی لی بکرێت. یان ئەو تاوانانەی کە سزاکەیان لە قورئاندا دیاری کراوە و پێیان دەگوترێت (العقوبات الحدية) کە سکاڵاکانیان گەشتنە دادگا ئیتر گەردن ئازادی ڕۆڵی نامێنێت و دەچێتە خانەی مافی گشتییەوە و دەبێت تاوانبارەکە سزای خۆی وەربگرێت، دەگێڕنەوە جارێکیان هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ عەباکەی خستبوە ژێر سەری و لەمزگەوتدا خەوتبو، کەسێك هات و عەباکەی لەژێر سەری دەرهێنا ویستی بیبات، پیاوەکە بەخەبەر هات و گرتی و گوتی: دەبێت بێیت لەگەڵم بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ، کەچونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، هاوەڵەکەی سکاڵای خۆی کرد و کێشەکەی ڕوون کردەوە و دزەکەیش دانی بەتاوانەکەیدا نا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە دەستی دزەکە ببڕن، هاوەڵەکەی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر عەباکەی من دەستی دەبڕن؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتی: من گەردنی ئازاد دەکەم و لێی خۆش دەبم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {فَهَلَّا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ}. (رواه أبو داود وإبن ماجة وصححه

الأرنؤوط والألباني). واتە: ئەی بۆ بەر لەوەی بیهێنیت بۆ من گەردنیت ئازاد نەکرد، ئەم ڕووداوە پێمان دەڵێت کە هەندێك ماف هەیە بەر لەوەی بگاتە دادگا دەکرێت چاوپۆشی لێ بکرێت، بەڵام کە گەیشتە دادگا چاوپۆشی لێ ناکرێت.

٣- بەڵگەی شەرعی هەبێت لەسەر لاچوونی مافەکە، وەك لاچونی مافی خەرجی ژن لەسەر هاوسەرەکەی ئەگەر لاساری کرد و پابەند نەبوو بە ئەرکەکانییەوە.

جگە لەم ڕیکارانە هیچ ڕێکارێکی تر نییە بۆ دەربازبوون لە مافی خەڵکی، نە تەوبە کردن، نەبڕیاری دادگا، نە تێپەڕبوونی کات و کۆن بوونی ماف، نەمردن و نەمانی خاوەن ماف یان ماف خۆر یان خودی مافەکە، هیچ کام لەوانە مافی خەڵکی لانابات، و هەرمافێك لەدونیایش نەدرێت خوای گەورە لە دوارۆژ و قیامەت تۆڵەی لە مافخۆران دەکاتەوە و قەرەبووی مافخوراوان دەکاتەوە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی فەرموودە و کۆدەنگی زانایانەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلِمَةٌ لِأَخِيهِ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهَا، فَإِنَّهُ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ}.(رواه البخاري). واتە: هەر کەسێك ستەمێکی لەبراکەی کردوە و مافی خواردوە، با ئەمڕۆ بۆی بگێڕێتەوە و گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات، بەر لەوەی بچێتە قیامەت؛ چونکە لەوێ هیچ دینار و درهەمێك نییە تا بۆی بگێڕێتەوە.

٢- وە دەفەرموێت: {الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللهِ يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ، إِلَّا الدَّيْنَ}.(رواه مسلم). واتە: شەهید بوون لە پێناو ڕێبازی خوای گەورەدا هەموو تاوانێك دەسڕێتەوە، جگە لە ماف و قەرزی خەڵکی نەبێت.

٣- وە دەفەرموێت: {إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: من مرۆڤێکی ئاساییم وەکو ئێوە و ئێوەیش کێشە و سکاڵاکانتان دێننە لای من و لەوانەیە هەندێکتان لەوانی دیکە زمان پاراوتر و قسەزانتر بن و منیش بەپێی ئەوەی گوێم لێی دەبێت بڕیاردەدەم، بۆیە هەرکەس زانی کە من حەقی براکەیم پێداوە با وەری نەگرێت؛ چونکە ئەوە پشکێکە لە ئاگر من

پێی دەدەم. کەواتە ئەم فەرموودەیە پێمان دەڵێت کە بڕیاری دادوەر ئەگەر پێغەمبەریش بێت ﷺ مافی خەڵکی هەڵناوەشێنێتەوە و حەق هەر حەقە و نا حەقیش ناحەق تا ئەو ڕۆژەی خوای گەورە یەکلایان دەکاتەوە و مافی ماف خوراوان دەگێڕێتەوە و تۆڵە لە ستەمکاران دەکاتەوە.

٤- زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە هەر کەس مافی کەسێکی تری لابێت هیچ شتێك ئەو مافە هەڵناوەشێنێتەوە و لانابات، تەنانەت تەوبە و موسوڵمانبوونیش ئەو تاوانانە دەسڕنەوە کە مافی خوای گەورەن نەك مافی خەڵکین؛ هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك شاری مەککەی بەجێ هێشت پێشەوا عەلی لە جێگەی خۆی دانا تا ئەو ماڵ و ئەمانەتانەی قوڕەیش لایان دانابوو بۆیان بگێڕێتەوە.

**نموونە:**

١- قەرزی مارەیی خێزان پێشەکەی بێت یان پاشەکی قەرزە لە ئەستۆی هاوسەرەکەیدا و پێویستە پێی بدات، تەنانەت ئەو قەرزە بەمردنیش لاناچێت و ئەگەر کەسەکە مرد بەر لە دابەشردنی میراتییەکەی بەسەر میراتگرەکاندا، پێویستە قەرزی مارەیی خێزانەکەی لێ دەربکرێت، پاشان ئەگەر شتێکی مایەوە دابەش دەکرێت بەسەر میراتگرەکاندا.

٢- هەر کەس ماڵی کەسێکی خوارد یان فەوتاندی یان زیانی پێ گەیاند پێویستە هاوشێوەی ئەو ماڵە یان نرخەکەی بۆ بگێڕێتەوە یان خاوەنی مافەکە گەردنی ئازاد بکات، پاساوی خواردنەکەی هەرچی بێت مافی خاوەن ماڵەکە لانابات.

٣- درۆ و دزی و فێڵ و خەڵەتاندن چۆن لەگەڵ موسوڵمانێك حەرامە ودروست نییە، ئاوهایش لەگەڵ مەسیحی و جولەکە و ئاتایست و هەر ئاینزایەکی تریش حەرامە و دروست نییە؛ بۆیە هەر موسوڵمانێك کە ئەمڕۆ لە هەندەران و تاراوگەیە، ئەگەر لەسەر دۆسییەیەکی درۆ و هەڵبەستراو مافی پەناهەندەیی وەرگرتبێت، هەموو ئەو مووچە و مافانەی پێی دەدرێت هەرچەند و هەرچی و هەرچۆن و هەتا کەی بێت حەرامە و دروست نییە، هەر بەهەمان هۆکار هەموو ئیشێکی ڕەشیش حەرامە و دروست نییە؛ چونکە هەموو ئەوانە دەچنە خانەی درۆ و فێڵ و دزییەوە کە نابێت موسوڵمان لەگەڵ هیچ کەسی بکات.

## ڕێسای بیست و نۆ

## كل حق تعلق بالعين تعلق ببدلها إذا لم يبطل سبب استحقاقها

**واتە:** هەر مافێك پەیوەست بێت بە شتێکەوە، پەیوەست دەبێت بە جێگرەکەیشییەوە، بەمەرجێك هۆکاری مافدارێتییەکەی هەڵنەوەشابێتەوە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە تەواوکاری ڕێسای پێشووە و مەبەست لێی جێگیرکردنی مافەکان و زیادکردنی ڕێگاکانی دەستەبەرکردنیانە جا مافەکان هی خوای گەورە بن یاخود خەڵکی جیاوازی نییە. هەر بۆیە هەر کەسێك مافی کەسێکی تری لابێت پێویستە بۆی بگێڕێتەوە، جگە لەحاڵەتێك نەبێت کە ئەگەر هۆکاری خاوەندارێتی و مافەکە هەڵوەشابێتەوە. بۆ نموونە: کەسێك قەرزی لەکەسێك کردوە و بەبارمتە خانویەکی لاداناوە، دواتر خانوەکە بەرجادە کەوت، ئەگەر قەرزارەکە پارەکەی گێڕایەوە بۆ خاوەن قەرزەکە، دواتر هەر قەرەبوویەك بۆ خانوەکە دەرچوو بۆ خاوەن خانوەکە دەبێت و هیچ مافێکی خاوەن قەرزەکەی پێوە نییە، چونکە ئەو خانوەکەی لەبارمتەی قەرزەکەدا لا دانراوە، و ئێستا مافەکەی خۆی کە قەرزەکەیە وەرگرتۆتەوە؛ بۆیە هیچ مافێکی بەخانوەکەوە نەماوە و هەر مافێك هەبێت هی قەرزارەکە خۆیەتی.

**نموونە:**

١- کەسێك قەرزێکی لای کەسێکی ترە، قەرزارەکە کەفیلێکی دەداتێ، ئێستا خاوەن قەرزەکە دەتوانێت داوای پارەکەی لە کەفیلەکەی بکات هەر وەك چۆن دەتوانێت لەقەرزارەکەی بکات، وە ئەگەر قەرزارەکە نەیبوو بیداتەوە پێویستە کەفیلەکەی بیداتەوە.

٢- کەسێك نەزری کرد مەڕێك بکات بە خێر یان بە قوربانی، دواتر کەسێك مەڕەکەی کوشت یان سەری بڕی، ئەو پارەیەی کە لەقەرەبووی مەڕەکە وەری دەگرینەوە، دەبێت بدرێتەوە بە مەڕێکی تر و بۆ نەزرەکە سەرببڕدرێت؛ چونکە مەڕی یەکەم کە نەزر کراوە قەرەبووکەیشی دەبێت بکرێتەوە بە نەزر.

٣- کەسێك خانویەکی وەقف کرد بۆ مزگەوت، دواتر خانوەکە بەرجادە کەوت و حکومەت قەرەبووی خاوەنەکەی کردەوە، دەبێت قەرەبووکە بدرێتەوە بە خانویەك بۆ مزگەوت دروست نییە خاوەنەکەی ۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت.

٤- ئەگەر کەسێك وەسیەتی کرد باخەکەی بدرێت بە خەڵکی هەژار و دواتر یەکێك لەمیراتگرەکان باخەکەی سوتاند، پێویستە قەرەبووی باخەکە بەنرخی ڕۆژ بۆ خەڵکانی هەژار بکاتەوە و بیانداتەوە.

٥- کەسێکی قەرزار لە بارمتەی قەرزەکەی زەوییەکی لای خاوەن قەرزەکە داناوە، دواتر قەرزارەکە زەوییەکەی فرۆشت، ئێستا پێویستە لەسەری لەبری زەویەکە موڵکێك یان شتێکی تر بداتە خاوەن قەرزەکە وەك بارمتەی قەرزەکەی.

## ڕێسای سی

## إسقاط الحق قبل وجود سببه لا يصح

**واته:** دەست هەڵگرتن لە ماف بەر لە دەستەبەربوونی هۆکارەکەی دروست نییە.

ڕێسایەکی ترمان هەیە کەجەخت لەسەر هەمان واتە دەکاتەوە و پێمان دەڵێت: (التصرف إذا لم يصادف محله يكون لغواً). واتە: هەر مامەڵە و هەڵسوکەوتێك لەسەر شتێك کە بوونی نییە و بەردەست نیە، یان مافی کەسەکە نییە، بەتاڵە و دروست نییە.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە یەکێکی ترە لەو ڕێسایانەی کە لەپێناو پاراستنی مافی مرۆڤەکان و بەرژەوەندییەکانیان داڕێژراوە و ڕێساکە پێمان دەڵێت: دروست نییە کەسێك دەست لەمافێکی خۆی هەڵبگرێت تا مافی خاوەندارێتی بەتەواوی لەسەر ئەو شتە جێگیر نەبێت و شێواز و ژمارە و قەبارە و سرووشتی مافەکەی خۆی نەزانێت. هەر کات ئەوانەی لا ڕوون بویەوە ئەو کات دەتوانێت دەستبەرداری مافەکەی بێت.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی فەرموودە و بەڵگەی ئاوەزییەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {لَا طَلَاقَ فِيمَا لَا تَمْلِكُونَ، وَلَا عَتَاقَ فِيمَا لَا تَمْلِكُونَ، وَلَا نَذْرَ فِيمَا لَا تَمْلِكُونَ}. (رواه أحمد في المسند وحسنه الأرنؤوط). واتە: تەڵاقی کەسێك ناکەوێت کە هاوسەری نییە ، وە ئازاد کردنی کۆیلەیەك دروست نییە کە تۆ خاوەنی نیت، وە نەزر کردنی شتێکیش دروست نییە کە هی تۆ نییە و تۆ خاوەنی نیت.

٢- بەڵگەی لۆژیکی و ئاوەزیش ئەوەمان پێ دەڵێت کە مرۆڤ مافی بەخشین یان دەست لێهەڵگرتنی مافێکی نییە کەهی ئەو نییە.

**نموونە:**

١- ئەگەر ئافرەتێك بەر لە جیابونەوەی لە هاوسەرەکەی بڵێت: من مافی دایەنی منداڵەکانم ناوێت، دوای جیابوونەوە مافی خۆیەتی داوای بکات؛ چونکە دەست لێهەڵگرتنی پێشووی بەر لەبوونی مافەکە بووە و دروست نییە.

٢- ئەگەر دووکەس لە دوکانێك یان خانوییەکدا هاوبەش بوون و یەکێك لە هاوبەشەکان ویستی پشکەکەی خۆی بفرۆشێت، هاوبەشەکەی تر مافی هەیە بەنرخی بازاڕ لێی بکڕێتەوە و نەهێڵێت بیفرۆشێتە کەسێکی ترو بەمە دەگوترێت مافی هاوبەشی بوون (حق الشفعة)، خۆ ئەگەر یەکێك لە هاوبەشەکان بەر لە فرۆشتن دەستی لەو مافەی خۆی هەڵگرت و بەهاوبەشەکەی تری گوت: پشکی خۆت بەکێ دەفرۆشیت بیفرۆشە، بۆی هەیە دوای فرۆشتن داوای مافەکەی بکاتەوە وبڵێت بەو نرخەی فرۆشتوتە من دەمەوێت؛ چونکە دەست هەڵگرتنی پێشووی لەو مافە بەر لە جێگربوونی دروست نییە.

٣- کەسێك بە ژنی دراوسێکەیان یان هەر ئافرەتێك تر کە خێزانی ئەم نییە بڵێت تەڵاقت کەوتبێت، تەڵاقی ناکەوێت؛ چونکە ئەم هیچی ئەو نییە و مافی تەڵاقدانیشی بەدەست ئەم نییە بەڵکو بەدەست هاوسەرەکەی خۆیەتی.

٤- ئەگەر هەر میراتگرێك بەر لە مردنی میراتلێگیراوەکە گوتی من بەشە میراتی خۆم لە فلان کەس ناوێت، ئەو دەستهەڵگرتنەی دروست نییە و پاش مردنی میراتلێگیراوەکە دەتوانێت داوای بەشەمیراتی خۆی بکات.

٥- لە مامەڵەی کڕین و فرۆشتندا ئەگەر کڕیار گوتی: لەسەر متمانە کاڵاکەت لێ دەکڕم و بینینی ناوێت، مەرجەکەی دروست نییە و هەرکات کاڵاکەی بینی مافی خۆیەتی کاڵاکەی نەوێت.

٦- ئەگەر کەسێك بەکەسێکی گوت: غەیبەتم بکە، درۆم بەدەمەوە بکە، بوختانم بۆ بکە، گەردنت ئازاد بێت، ئەو گەردن ئازادییە دروست نییە، و کەسەکەیش بۆی نییە ئەوانەی بەرامبەر بکات، بەڵام ئەگەر ئەو شتانە ڕویان دا، ئەو کات بۆی هەیە گەردنی ئازاد بکات.

٧- هەر کرێکارێك بە خاوەن کارەکەی گوت: من ئەو کارەت بۆدەکەم و هەرچیشم بەسەر هات لە ئەستۆی خۆم و تۆ بەرپرسیار نیت، ئەم لێبوردنە دروست نییە، و ئەگەر توشی هەر زیانێك بوو بەهۆی کارەکەوە ئەوکات بۆی هەیە داوای قەرەبوو بکات.

## ڕێسای سی و یەک
## الحق لا يسقط بتقادم الزمان

**واتە:** ماف بە تێپەڕبونی كات و كۆن بوون كۆتایی پێ نایەت و لەناو ناچێت.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە تەواوكاری ڕێساكانی ترەو هەمان ئامانجی ئەوانی هەیە كە خۆی لە پاراستنی مافی مرۆڤەكاندا دەبینێتەوە چەند كۆن بن و كاتیش بەسەریاندا تێپەڕ بێت؛ بۆیە شەرع پارێزگاری لەو مافانە دەكات و تا قیامەت داواكارە لەسەریان و ڕێگە نادات بە هیچ كەس پێشێلكاری بكات و بە هەموو ئومەت دەڵێت كەس ئەو مافە نەخوات؛ چونكە هی خەڵكێكە و لێی زەوت كراوە. ئەو مافانەیش مافی خوای گەورە بن یان خەڵكی، مافی گشتی بن یان تایبەتی، مادی بن یان مەعنەوی هیچ جیاوازییان نییە و وەك خۆیان دەمێننەوە و كۆن نابن و هەموو كات خاوەنەكانیان مافی وەرگرتنەوەیان هەیە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و فەرموودەو ڕێسای شەرعییەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ولاَ تَأْكُلُوا أَمْوالَكُمْ بَيْنَكُمْ بالباطِلِ﴾. (سورة البقرة: ١٨٨).
واتە: ماف و ماڵی یەكتر لە نێوان خۆتاندا بەناڕەوا مەخۆن، ئایەتەكەیش ڕەهاو گشتگیرە و هەموو كات و كەس و جۆرە خواردنێكی ناڕەوا دەگرێتەوە بێ جیاوازی لە نێوان كۆن و نوێدا.

٢- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ}. (رواه البخاري و مسلم). واتە: من مرۆڤێكی ئاساییم وەكو ئێوە و ئێوەیش كێشە و سكاڵاكانتان دێننەلای من و لەوانەیە هەندێكتان لەوانی دیكە زمان پاراوتر و قسەزانتر بن و منیش بەپێی ئەوەی گوێم لێی دەبێت بڕیاردەدەم، بۆیە هەركەس زانی كە من حەقی براكەیم پێداوە با وەری نەگرێت؛ چونكە ئەوە پشكێكە لە ئاگر من پێی دەدەم. كەواتە ئەم فەرموودەیە پێمان دەڵێت كە بڕیاری دادوەر ئەگەر پێغەمبەریش بێت ﷺ مافی خەڵكی هەڵناوەشێنێتەوە و حەق هەر حەقە و نا حەقیش

ناحەق تا ئەو ڕۆژەی خوای گەورە یەکلایان دەکاتەوە و مافی ماف خوراوان دەگێڕێتەوە و تۆڵە لە ستەمکاران دەکاتەوە.

٣- پێشەوا عومەر کاتێك ئەبو موسای ئەشعەری دەکات بە دادوەر نامەیەکی بۆ دەنێرێت و تێیدا پێی دەڵێت: (فَإِنَّ الْحَقَّ قَدِيمٌ، وَإِنَّ الْحَقَّ لَا يُبْطِلُهُ شَيْءٌ). (رواه البيهقي، والدارقطني). واتە: ماف بەردەوامە و درێژەی هەیە و کۆن نابێت و هیچ شتێکیش مافی خەڵکی هەڵناوەشێنێتەوە.

٤- ڕێسای (الإستصحاب) کە بە واتەی مانەوەی شتەکان لەجێی خۆیان دێت، ئەو مافانەیش لە بنەڕەتدا هی خەڵکی بوون و هەر وەك خۆیشیان دەمێننەوە و گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت.

**نموونە:**

١- کەسێك تۆمەتی داوێن پیسی دایە پاڵ کەسێکی تر، یان دزی لێکرد، یان بەناڕەوا کوشتی و خوێنی ڕشت، هیچ کام لەو مافانە هەرگیز کۆن نابن و خاوەنەکانیان هەر کات بۆیان هەڵکەوت دەتوانن داوای مافی خۆیان بکەن.

٢- لە کاتی دابەشکردنی میراتدا میراتگرێك لەبیر کراوە، یان مافی خوراوە، هەرکات توانی و هەر چەندی بەسەردا تێپەڕ بووبێت دەتوانێت داوای مافی خۆی بکاتەوە.

٣- مارەیی ژن لە لای پیاو مافێکی جێگیرە و هەرگیز لەناو ناچێت، نە بەمردنی ژنەکە خۆی نە بە مردنی مێردەکەی، نە بەهیچ شتێکی تر ئەو مافە لەناو ناچێت.

٤- دەست بەسەراگرتنی هەر پارچە زەوییەك یان ئۆتۆمبێلێك یان هەر شتێکی تر بێت، هی هاوڵاتی و مافی تایبەت بێت، یان هی دەوڵەت و مافی گشتیی دەبێت بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی هەرکەسێك بێت، وە ئەو مافە هەرگیز لا ناچێت و کۆن نابێت، هەر بۆیە هەموو ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە ناونرابوون (علوج) و مافی گشتی بوون هەموویان بەدزی ئەژمار دەکرێن وئێستایشی لەگەڵدا بێت کە هەندێك بەڵگەنامەی ساختەیان بەپارە بۆ کراوە، مامەڵەپێوەکردنیان شەرعی نییە و حەرامە ودەبێت بگەڕێنەوە بۆ دەستێکی ئەمین کە لەبەرژەوەندی گشتیدا بەکاریان بهێنێت.

٥- کەسێك پارەی هەبووە و دەرفەتی حەج کردنیشی هاتۆتە پێش و هیچ ڕێگرییەکیشی نەبووە بەڵام نەیکردوە، ئەو کەسە حەجی لەسەر واجب بووە و هەر دەبێت بیکات و ئەگەر بمرێت دەبێت کەسوکارەکەی حەجی بۆ بکەن، ئەگینا ئەو فەرزەی بەهیچ لەسەر لاناچێت.

٦- کەسێك (١٠٠٠٠) دۆلاری هەبوو، وە دەبوو مانگی چوار زەکاتی لێدەربکات، بەڵام کەمتەرخەمی کرد و نەیدا، مانگی پێنج ئیفلاسی کرد، بڕی ئەو زەکاتەی دەبوو بیدات کە دەکاتە (٢٥٠) دۆلار دەبێتە قەرز و دەچێتە ئەستۆی و هەردەبێت بیدات پێش مردن یان پاش مردن لەئەستۆی لاناچێت.

## ڕێسای سی و دوو

## حق العبد لا يتوقف على القصد

**واته:** لە بەرامبەر مافی خەڵکدا کار بەنییەت ناکرێت.

**گرنگی:** ئەمە ڕێسایەکی ترە لە ڕێساکانی تایبەت بە پاراستنی مافی بەندەکان و ئامانج لێی ڕێگرتنە لەهەر فێڵ و چاوبەستێك کە بۆ ئەو مەبەستە بکرێت؛ چونکە ئێمە پێشتر و لەیەکەم ڕێسادا باسی ئەوەمان کرد کە **(الأمور بمقاصدها)** واتە: هەر کارێك بە پێی مەبەستی خاوەنەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و هەر بەو پێیەیش سزا و پاداشت وەردەگرێت. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم ڕێسایە تەنها لەنێوان خوای گەورە و مرۆڤەکاندا کاری پێ دەکرێت؛ چونکە خوای گەورە ئاگادارە لە نیەتی دڵەکان و کەس ناتوانێت لەو ڕووەوە فێڵ یان درۆی لەگەڵ بکات، بەڵام مرۆڤەکان وانین و توانای خوێندنەوەی نیەتی دڵەکانیان نییە و نازانن چی تێدا دەگوزەرێت و چ گۆڕانکارییەکەی بەسەردا دێت، هەر بۆیە لەکاتی یەکلاکردنەوەی کێشەی نێوان مرۆڤەکان کار بە ڕێسای نیەت ناکرێت، بەڵکو کار بە ڕوکەشی کردەوەکان دەکرێت و نیەت ڕۆڵێکی ئەوتۆی نامێنێت، ئەمەیش وەکو گوتمان بۆ ڕێگرتنە لەهەر فێڵ و تەڵەکەیەك کە کەسێك بیەوێت لەبەرامبەرەکەی بکات و درۆی لەگەڵ بکات.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ﴾. (سورة النساء: ٩٢). واتە: هەر بڕوادارێك بەهەڵە بڕوادارێکی تری کوشت، ئەوە دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکات، و خوێنی کوژراوەکەیش بە کەس و کاری بدات. خۆ لێرەدا بکوژەکە مەبەستی کوشتنی بەرامبەرەکەی نەبووە و کوشتنەکەی بەهەڵە بووە و پێی تاوانبار نابێت، بەڵام نەبوونی ئەو مەبەستە نابێتە مایەی هەڵگرتنی مافی خانەوادەی کوژراوەکە؛ بۆیە دەبێت بکوژەکە خوێنی کوژراوەکەیان پێ بدات.

٢- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: {يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ بِهِ صَاحِبُكَ}. (رواه مسلم). واتە: سوێندەکەت لەسەر ئەو بابەتەیە کە بەرامبەرەکەت باوەڕت پێدەکات.

٣- وە دەفەرمویێت: {الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ}. (رواه مسلم). واتە: سوێند خواردن لەسەر نیەتی ئەو کەسەیە کە سوێندت دەدات، نەوەك ئەو کەسەی کە سوێند دەخوات.

ئەمەش خاڵێکی گرنگە و پێویستە لێی تێ بگەین و ئاگاداری بین؛ چونکە بەم پێیە بێت زۆرێك لەو سوێندانەی خەڵکی لە کاتی یەکلاکردنەوەی کێشەکاندا دەیخۆن کە بە حسابی خۆیان بە پێچ و پەنا دەیخۆن و لە دڵی خۆیاندا لەسەر شتێکی تر سوێند دەخۆن کە پەیوەندی بە باتەکەوە نییە، هەموو ئەمانە دەچنە خانەی سوێندی درۆوە و کەسەکان لەسەری گوناهبار دەبن.

**نموونە:**

١- مرۆڤی شێت کە مەبەستەکانی کاری پێ ناکرێت و هیچ تەکلیفی شەرعی لەسەر نییە، ئەگەر زیانی لە ماڵی خەڵکی دا پێویستە لەماڵی خۆی یان سەپەرشتیارەکەی قەرەبووی کەسی زیانلێکەوتو بکاتەوە، ڕاستە پێی تاوانبار نابێت لە ڕووی شەرعییەوە و تۆڵەی هیچ سزایەکی جەستەیی لێ ناکرێتەوە؛ بەڵام ئەو حاڵەتە مافی خەڵکیشی لەسەر لانادات وپێویستە لە ڕووی داراییەوە قەرەبوی زیانلێکەوتوانی بکاتەوە.

٢- لە ڕووداوەکانی هاتوچۆدا ئەگەر کەسێك سەرەڕای جێبەجێ کردنی هەموو مەرجە یاساییەکان تووشی ڕوداوی هاتوچۆ بوو، ئەوە ڕاستە تاوانبار نابێت، بەڵام پێویستە قەرەبووی هەر زیانێکی مادی بکاتەوە کە لەکەسی بەرامبەری داوە، و ئەگەریش ڕوداوەکە ببوە هۆی گیان لەدەستدانی کەسێك ئەوە پێویستە جگە لەپێدانی مافی کەسوکارەکەی دوو مانگ لەسەر یەکیش بەڕۆژوو بێت وەك کەفارەتی کوشتنی بەهەڵە.

٣- ئەگەر بەهۆی هەڵەی پزیشکێکەوە لە کاتی نەشتەرگەریدا یان چارەسەردا نەخۆشێك زیانی پێ کەوت، ئەوە ڕاستە پزیشکەکە تاوانبار نابێت، بەڵام پێویستە قەرەبوی دارایی نەخۆشەکە بکاتەوە. ئەم ڕێسایەیش تەنها بۆ پزیشکەکان نییە بەڵکو هەموو خاوەن پیشەکان دەگرێتەوە، ئەگەر بەهۆی پیشەکانیانەوە زیانیان بەکەسی بەرامبەر گەیاند

٤- کەسێك ناچاربوو لە برسا ماڵی کەسێکی تر بخوات شەرع ڕێگەی پێ دەدات ئەو کارە بکات؛ بەڵام پێویستە دواتر قەرەبووی دارایی کەسی مافخوراو بکاتەوە.

٥- ئەگەر دادوەر لە پرۆسەی دادگایکردندا بە بێ مەبەستی ستەم کردن سزای کەسێکی دا و دواتر دەرکەوت بڕیاری سزادانەکەی هەڵەیە، پێویستە ئەو کات قەرەبووی دارایی کەسی زیان لێکەوتو بکاتەوەو قەرەبووەکەیش پێویستە دەوڵەت بیدات نەك خودی دادوەر؛ چونکە ئەو بەناوی دەوڵەتەوە بڕیار دەدات و کارمەندی ئەوە.

## ڕێسای سی و سێ

## الجواز الشرعي ينافي الضمان

**واتە:** هەر كارێك لە شەرعدا ڕێگە پێدراو بوو، هیچ قەرەبوو بەرپرسیارێتییەك ناكەوێتە ئەستۆی بكەرەكەی.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە هاوسەنگی و دادوەری شەریعەت نیشاندەدا لە تێڕوانینی بۆ ماف و ئەركی لایەنەكانی گرێبەستەكان، بەشێوەیك كە خاوەن پیشەو ئەركە گشتی و تایبەتەكان بتوانن دەست كراوە بن لەكاتی ئەنجامدانی پیشە و ڕاپەڕاندنی ئەركەكانیاندا، و ترسی بەرپرسیارێتی ڕاپەڕاندنی ئەو ئەركانە لە ئەستۆ نەگرن؛ چونكە ئەگەر وا نەكرێت، هیچ كەس ناوێرێت هیچ ئەرك و پیشەیەك بگرێتە ئەستۆ. لە هەمان كاتدا بەرامبەرەكانیشیان دڵنیا بن لە پاراستنی مافەكانیان لەكاتی ڕوودانی هەر هەڵەیەك كە بەهۆی پیشە و كارەكانی ئەمانەوە تووشیان دەبێت؛ بۆیە ئەم ڕێسایە بۆ پاراستنی خاوەن ئەرك و پیشە و فەرمانبەرە گشتییەكانە، ڕێسای پێشووتریش بۆ پاراستنی بەرامبەرەكانیانە.

بە لێكدانی هەردوو ڕێساكە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی كە هەر خاوەن پیشەو ئەركێك ئەگەر وەك پێویست و بەبێ هەڵە ئەرك و كارەكانی خۆی جێبەجێ كرد، ئەو كات كەسی بەرامبەر مافی داواكردنی هیچ قەرەبوویەكی نییە و نابێت، ئەگەر چی بەهۆی ئەو كارە یان پیشەیەوە زیانیشی لێكەوتبێت، بەڵام ئەگەر خاوەن پیشەو كارەكە هەڵەی كرد لە كاتی جێبەجێ كردنی كارەكەیدا، ئەو كات كەسی بەرامبەر مافی داواكردنی قەرەبووی هەیە، بە پێی ئەو زیانەی كە لەدەرەنجامی هەڵەكە بەری كەوتوە.

هەر بۆیە و بەپێی ئەم ڕێسایە هیچ زیانێك قەرەبوو ناكرێتەوە، ئەگەر زیانەكە بەهۆی كارێكەوە یان بەكارهێنانی مافێكەوە بێت كەشەرع ڕێگەی پێدابێت، بەمەرجێك زیادەڕەوی تێدا نەكرابێت، وەك مافی تۆڵەسەندنەوە، یان لە كاتی جێبەجێ كردنی سزا شەرعییەكاندا.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ فَخَذَفْتَهُ بِعَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ}.(رواه البخاري). واتە: ئەگەر كەسێك سیخوڕی بەسەرەوە كردیت و چاودێری ماڵەكەی كردیت و تۆیش بەردێكت تێگرت و بەر چاوی كەوت و كوێری كرد، گوناهبار نابیت.

٢- صەفوانی كوڕی یەعلای كوڕی مونیە لەباوكییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ وَقَدْ عَضَّ يَدَ رَجُلٍ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ، فَسَقَطَتْ ثَنِيَّتَاهُ. قَالَ: فَأَبْطَلَهَا النَّبِيُّ ﷺ، وَقَالَ: {أَرَدْتَ أَنْ تَقْضَمَهُ كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ؟}..). (رواه مسلم). جارێكیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ، قەپی كردبوو بەدەستی پیاوێكی تردا، كە ئەو پیاوە لەتاو ئازار دەستی لەدەمی دەرهێنابوو، هەردوو ددانی پێشەوەی ئەو پیاوەی لەگەڵ دەستی خۆی دەرهێنابوو، پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ مافێكی پێ نەداو فەرمووی: ویستت وەك حوشتر قەپ بكەیت بەدەستیدا و دەستی بپچڕیت؟!.

٣- ئەبو هورەیە بۆمان دەگێڕیتەوە و دەڵێت: (جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: {فَلَا تُعْطِهِ مَالَكَ} قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قَالَ: {قَاتِلْهُ} قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: {فَأَنْتَ شَهِيدٌ}، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: {هُوَ فِي النَّارِ}..). (رواه مسلم). واتە: جارێكیان پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: ئەگەر پیاوێك هات و ویستی ماڵەكەم لێ داگیر بكات چی بكەم؟ فەرمووی: مەهێڵە بیبات. گوتی: ئەی ئەگەر شەڕی لەگەڵ كردم؟. فەرمووی: شەڕی لەگەڵ بكە. گوتی: ئەی ئەگەر كوشتمی؟ فەرمووی: تۆ شەهیدیت. گوتی: ئەی ئەگەر كوشتم؟. فەرمووی ئەو دەچێتە دۆزەخ.

كەواتە هەر یەك لەوانەی لە فەرموودەكاندا باس كراون، مافی بەگری لەخۆكردنیان - بەپێی پێویست و بێ زیادە ڕەوی- پێ دراوە، و لەسەر ئەو مافەیش هەرچی بەسەر كەسی بەرامبەریان بێت قەرەبوی نییە.

**نموونە:**

١- کەسێك لە شوێنێکدا دوکان یان مارکێتێکی کردەوە و ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە کڕیارەکانی مارکێتەکانی تری ئەو شوێنە کەم ببنەوە، هیچ کێشەی نییە؛ چونکە ئەم تەنها مافی خۆی بەکارهێناوە و هیچی تر.

٢- کەسێك لەزەویەکی تایبەت بەخۆیدا بیرێکی هەڵکەند، دواتر کەسێك بەبێ پرسی ئەم چووە ناو زەویەکەوە و کەوتە بیرەکەوە، خاوەن زەویەکە تاوانبار نابێت؛ چونکە مافی خۆی بەکار هێناوە و بیرەکەی لە زەوی خۆیدا لێداوە، ئەو کەسە خۆی بەرپرسیارە کە بەبێ پرس چۆتە زەوی خەڵکانی ترەوە.

٣- کەسێك سزایەکی شەرعی کەوتە سەر، وەك بڕینی دەستی لەسەر دزی، یان شەلاق لێدانی لەسەر زینا و بەو هۆیەوە مرد یان تووشی نەخۆشی بوو، نەخۆی نە میراتگرەکانی هیچ قەرەبوویەك وەرناگرن؛ چونکە مافێکی شەرعییان بەسەرەوە بووە و لێیان وەرگیراوەتەوە.

٤- دوو کەس هابەش بوون لە کارێك یان بازرگانییەکدا و یەکێکیان توشی زیان هات بەهۆی ئەو کاری بازرگانییە هاوبەشەیانەوە، زیانەکە بەسەر هەردووکیاندا دابەش دەکرێت؛ نەك تەنها ئەو کەسەی زیانەکەی لێ کەوتوە؛ چونکە ئەو تەنها مافی هاوبەش بوونی خۆی بەکارهێناوە و هیچ زیادەڕۆوییەکی نەکردوە.

## ڕێسای سی و چوار

## لا ضمان على مؤتمن

**واتە:** ئەو كەسەی كە ئەمینداره لەسەر كارێك، یان لەسەر شتێك، لەكاتی ڕوودانی هەر زیانێكدا، قەرەبووی زیانی كارەكە یان شتەكە ناكەوێتە ئەستۆی ئەو.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە دەقی فەرموودەیەكی پێغەمبەرە ﷺ و نزیكە لە ڕێسای پێشوو و مەبەست لێی پاراستنی خەڵكانی سەر ڕاست و خاوەن پیشەكانە، كە كاتێك خەڵكی شتێكیان لا دادەنێت یان كارێكیان پێ دەسپێرێت، دواتر ئەو شتە بەبێ هیچ كەمتەرخەمییەكی ئەمان زیانێكی پێ دەكەوێت، ئەو زیانە ناچێتە ئەستۆی ئەوان و لێی بەرپرسیار نین، لەبەر ئەوەی خەڵكانێكی متمانەپێكراون و ئەگەر پارێزبەندییان بۆ نەكرێت، ئەو كات هیچ كەس ناتوانێت كاری گشتی بكات یان ئەمینداری كاری خەڵكی بكات؛ جا ئەسپاردەو ئەمیندارێكە بەحوكمی شەرع پێیان درابێت، وەك سەرپەرشتیاری كردنی كەسی منداڵ لەلایەن كەسوكارییەوە لە بابەتە دارایی و كەسییەكاندا، یان لەسەر خواستی كەسەكە خۆی بووبێت، وەك ئەوەی كەسێك خۆی بەخواستی خۆی و بە ئەمانەت شتێك لای كەسێكی تر دابنێت، یان بەبێ هیچ كام لەوانە كەسەكە ئەو شتەی كەوتبێتە بەردەست، وەك ئەوەی كەسێك شتێك بدۆزێتەوە ئەو كات دەستی ئەو لەسەر ئەو شتە دەبێتە ئەسپاردە و ئەمینداری.

لە هەموو ئەو حاڵەتانەیشدا ئەگەر بەهۆی كەتەرخەمی یان هەڵەی ئەمانەوە زیان بە كەسی بەرامبەر یان كارەكەی یان كاڵا ئەسپاردەكراوەكە كەوت، ئەو كات پێویستە لەسەریان قەرەبووی زیانەكە بۆ كەسی زیان لێكەوتو بكەنەوە؛ هەر وەك ڕێسا شەرعییەكەی تر دەڵێت: **(المفرط ضامن)**. واتە: كەسی كەم تەخەم بەرپرسیارە و دەبێت قەرەبوو بكاتەوە.

لەشەرعدا چوار هۆكار هەیە بۆ قەرەبووكردنەوە:

١- دەقێكی شەرعی لەسەر قەرەبوكردنەوە هەبێت: وەك ئەو دەقانەی لەسەر كەفارەتی سوێند، و كوشتنی هەڵە هەیە.

٢- لایەنەكانى گرێبەستەكە خۆیان بچنە ژێر بارى ئەوەى قەرەبوى یەكتر بكەنەوە: وەك ئەوەى لە هەندێك بابەتى كڕین و فرۆشت، یان كەفالەتدا دەكرێت.

٣- كەسێك بەهۆى كەمتەرخەمى یان بە هەڵە یان بەبێ پاساو زیان بەماڵ یان گیانى كەسێكى تر بگەیەنێت ج بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، ئەو كات پێویستە قەرەبوى زیانەكە بۆ كەسى زیانلێكەوتو بكاتەوە.

٤- داگیر كردن و دەست بەسەردا گرتن: بە دزى یان درۆ یان هێز یان هەر هۆكارێكى تر.

لە هەموو ئەم حاڵەتانەشدا پێویستە كەسەكە قەرەبووى زیانەكانى كەسى بەرامبەر بكاتەوە.

دەستى ئەمیندارى و ئەسپاردەكارى ناچێتە ژێر هیچ كام لەم جۆرانەوە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقى قورئان و فەرموودەوە سەرچاوەى گرتووە لەوانە:

١- خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئاً﴾. (سورة البقرة: ٢٨٢). واتە: با ئەو كەسەى ئەسپاردە یان ئەمانەت یان قەرزەكەى لایە، خۆى دان بەو مافەدا بنێت كە لەلایەتى و لەخوا بترسێت و هیچى لێ كەم نەكاتەوە، كەواتەو بەپێى ئەم ئایەتە قسەى ئەو كەسەى ئەسپاردەكەى لایە وەردەگیرێت و دەكرێتە بنەما بۆ ئەو مافەى كە لایەتى، هەر بۆیە خواى گەورە بیرى دەخاتەوە و سەرزەنشتى دەكات، بەوەى لەخوا بترسێت و ڕاستى چییە ئەوە بڵێت، خۆ ئەگەر وانەبوایە ئەو كات پێویستى بەوە نەدەكرد كە بەو شێوەیە بیرى بخاتەوە یان ئامۆژگارى بكات.

٢- وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَاماً﴾. (سورة النساء: ٥). واتە: ئەو پارە و داهاتەى كە خواى گەورە ئێوەى كردۆتە سەپەرشتیارى، ڕادەستى ئەو منداڵ و كاڵفامانەى مەكەنەوە نە با نەزانن بەكارى بهێنن و هەمووى خەرج بكەن، كەواتە لێرەدا خواى گەورە مافى ئەوە دەداتە كەسانێكى پێگەیشتو كە سەرپەشتیارى پارەى ئەو هەتیو و منداڵانە بكەن كە خۆیان تواناى بەڕێوەبردنى كارەكانیان نییە و پارەكانیش بە

پارەی خۆیان ناو دەبات و دەفەرمویێت ﴿أَمْوَالَكُمْ﴾ تا پارەی ئەو هەتیوانە وەك پارەی خۆیان تەماشا بكەن و ئەو پەڕی دڵسۆزی بنوێنن لە وەبەرهێنان و پاراستنیدا.

٣- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: {لَا ضَمَانَ عَلَى مُؤْتَمَنٍ}.(رواه البيهقي والدارقطني وحسنه الألباني في صحيح الجامع). ئەو كەسەی كە ئەمینداره لەسەر كارێك یان شتێك، قەرەبووی زیانی كارەكەی یان ئەسپاردەكەی ناكەوێتە ئەستۆ.

٤- وە دەفەرمویێت: {مَنْ أُودِعَ وَدِيعَةً فَلَا ضَمَانَ عَلَيْهِ}.(رواه إبن ماجة وحسنه الألباني في صحيح الجامع). واتە: هەر كەس ئەسپاردەیەكی بەلاوە دانرا و پاشان فەوتا یان زیانی پێكەوت، قەرەبووی ئەسپاردەكەی ناكەوێتە ئەستۆ.

**نموونە:**

١- ئافرەتێك سوڕی مانگانەی لەسەر بوو، هەر كات گوتی سوڕی مانگانەكەم تەواو بووە، قسەكەی وەردەگیرێت و كاری پێ دەكرێت.

٢- بریكار هەر كارێك بكات بەناوی ئەو كەسەی كارەكەی ئەسپاردە كردوە كارەكەی دروستە و وەردەگیرێت، دەرەنجامەكەی هەرچی و هەرچۆن بێت.

٣- دوو هاوبەش كە پێكەوە كار دەكەن، هەر یەكێكیان كاڵایەكی كڕی یان فرۆشت، یان هەر مامەڵەیەكی پێوە كرد مامەڵەكەی دروستە و وەردەگیرێت.

٤- ڕاسپاردەیەكمان لای كەسێك دانا و دواتر لای ئەو فەوتا یان زیانێكی پێ گەیشت، ئەو بەرپرسیار نییە لە قەرەبوكردنەوەی.

٥- پزیشكێك یان پارێزەرێك یان فیتەرێك یان بەرگ درویەك كەدەچیتە لای تا كارێكت بۆ ئەنجام بدات، هەر ڕێكارێكی گرتە بەر لە پێناو ڕاپەڕاندنی كارەكەدا دروستە و بەرپرسیار نییە لەهەر زیانێك كە لەدەرەنجامی كارەكەی دەكەوێتەوە.

لەسەرجەم ئەو بابەتانەی باسمان كرد ئەو خەڵك و خاوەن كارانە دەست و دەمیان دەستی ئەمانەت و دەست پاكییە و بەرپرس نین لەهیچ زیانێك كە لەدەرەنجامی كارەكانیان دەكەوێتەوە، مەگەر كەمتەرخەمییان كردبێت لە ڕاپەڕاندنی كارو بەرپرسیارێتییەكەیاندا، تەنها ئەو كات بەرپرسیار دەبن، ئەگەر نا بەرپرسیار نابن.

## ڕێسای سی و پێنج

## الإحتيال على إبطال الحقوق الثابتة حرام

**واته:** فێڵكردن بۆ لەكۆڵكردنەوە و خۆ دەربازكردن لەمافە جێگیرەكان یاساغە و دروست نییە.

**گرنگی:** ئەم یاسایەیش تەواوكاری یاساكانی پێش خۆیەتی و جەخت لەسەر هەمان مەبەست دەكاتەوە كە پاراستنی مافەكانە و ڕێگری دەكات لەهەر پینە و فێڵ و پاساوێك بۆ خۆ دەربازكردن لە گێڕانەوەیان و پێمان دەڵێت هیچ مافێك بەفێڵ لەسەر خاوەنەكەی نەك لا ناچێت، بەڵكو تاوانەكەی دەبێت بە دوو تاوان كە تاوانی ماف خواردن و فێڵ و درۆكەیشی دەچێتە سەر.

هەر بۆیە هەموو فێڵ و درۆیەك بۆ خۆ دزینەوە لە ئەركە شەرعییەكان یان گێڕانەوەی مافەكانی خەڵكی حەرامەو دروست نییە.

شەرع هەندێك جار ڕێگە بەدرۆ و فێڵ دەدات بەڵام لە پێناو پاراستنی ژیان و ماف و بەرژەوەندی خەڵكیدا نەك بە پێچەوانەوە، بۆ نموونە: كەسێك دەیەوێت بە ناحەق كەسێكی تر بكوژێت و لەناونیشانەكەی دەپرسێت، تۆیش باش دەزانیت ئەو كەسە لە كوێیە، بەڵام حەرامە ناونیشاكەی بە بكوژەكەی بدەیت و پێویستە درۆی لەگەڵ بكەیت تا نەیدۆزێتەوە، خۆ ئەگەر ڕاستت لەگەڵ كرد و ناونیشانەكەت بەڕاستی پێدا و دۆزییەوە و كوشتی، ئەو كات تۆ بە هاوبەشی تاوانەكەی دادەنرێیت و وەك ئەوە وایە پێكەوە كوشتبێتتان.

بەڵام درۆیەك بۆ خواردنی مافی كەسێك بێت، یان بۆ لە خشتە بردنی خەڵك بێت، ئەم درۆیانە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە و حەرامە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی قورئان و فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَةٍ يُوصي بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَير مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِنَ اللهِ﴾. (سورة النساء: ١٢). ئەم ئایەتە باس لە شێوازی دابەشكردنی میرات و ئەو مافانەی

پەیوەستن بەماڵی میراتییەوە دەکات و دەفەرمویێت: بەر لە دابەشکردنی میراتەکە بەسەر میراتگرەکاندا پێویستە هەر قەرزێکی خوای گەورە یان خەڵکی لەسەر مردوەکە بێت، لەو ماڵە بگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، پاش ئەو ئەگەر مردوەکە وەسییەتێکی هەبوو بەبەخشینی بەشێك لەماڵەکەی بۆی جێبەجێ بکرێت؛ بەڵام بەمەرجێك مەبەستی مردوەکە لە وەسییەتەکەی زیان گەیاندن نەبێت بە میراتگرەکان، خۆ ئەگەر مەبەستی وەسییەتەکەی ئەوە بوو کە زیان بە میراتگرەکان بگەیەنێت، ئەو کات وەسییەتەکەی جێبەجێ ناکرێت، وە ئەمە وەسییەت و ئامۆژگاری خوای گەورەیە بۆ ئێمە. لێرەوە تێدەگەین کەهەر هەڵسوکەوتێك مەبەست لێی زیان گەیاندن بێت بە خەڵکانی خاوەن ماف دروست نییە و ناچێتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

٢- وەدەفەرمویێت: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾. (سورة البقرة: ٢٣١). واتە: هاوسەرەکانتان لای خۆتان مەهێڵنەوە بەمەبەستی ئەوەی ستەمیان لێ بکەن و داخ بەدڵیاندا بکەن و هەرکەس کاری وا بکات ئەوە ستەمی لەخۆی کردوە، نەك لەبەرامبەر، چونکە خۆی پێ تاوانبار دەبێت و لای خوای گەورە سزای تاوانەکەی وەردەگرێت، کەواتە خوای گەورە لەگەڵ بەردەوامی پرۆسەیەکدا نییە هەرچەند پیرۆزیش بێت وەك پرۆسەی خێزان، کە بە مەبەستی پێشێلکردنی مافی بەرامبەر درێژەی پێبدرێت.

٣- پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی زەکات دەفەرمویێت: {وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ}. (رواه البخاري). واتە: لەکاتی زەکات دەرکردندا دروست نییە کۆ پەرت بکرێت یان پەرت کۆ بکرێتەوە بەمەبەستی خۆ دزینەوە لە زەکات، بۆ نموونە: کەسێك بیست مسقاڵ ئاڵتونی هەیە و زەکاتی دەکەوێت، بەر لەوەی ساڵی بەسەردا تێپەڕێت و زەکات تێیدا واجب بێت دە مسقاڵی دەدات بە هاوسەرەکەی، کاتێك وادەی زەکات دێت، ئەم تەنها دە مسقاڵی هەیە و خێزانیشی دە مسقاڵ و زەکاتیش لە دە مسقاڵ ناکەوێت، بەو شێوەیە کۆی پەرت کرد و خۆی لە زەکاتەکە دەرباز کردو مافی هەژاری لێ نەدا.

یان سێ کەس یەکی چل سەر مەڕیان هەیە و کاتی زەکات دەبێت یەکی یەك سەر مەڕ بدەن بەزەکات، بۆ خۆ دزینەوە لەو ڕێژەیە مەڕەکان تێکەڵ دەکەن و دەبنە شەریك و

بەمەیش ژمارەی مەڕەكان دەبێت سەدوبیست سەر مەڕ و تەنها یەك سەر مەڕ زەكاتی تێدا واجب دەبێت. ئەمەیش كۆكردنەوەی پەرتە بەمەبەستی خۆ دزینەوە لە زەكات و ئەمەیش دیسان حەرامە و دروست نییە و مافی هەژارانی تێدا پێشێل دەكرێت.

٤- وە دەفەرموێت: {لَا تَرْتَكِبُوا مَا ارْتَكَبَتِ الْيَهُودُ، فَتَسْتَحِلُّوا مَحَارِمَ اللهِ بِأَدْنَى الْحِيَلِ}. (الجامع الصحيح للسنن والمسانيد وحسنه الألباني وغيره). واتە: هەمان ئاكاری جولەكەكان دووبارە مەكەنەوە و حەرامەكانی خوای گەورە بەكەمترین فێڵ بۆ خۆتان حەڵاڵ بكەن.

**نموونە:**

١- هەر كەسێك خۆی نەخۆش یان نەدار یان نەزان نیشان بدات تا خۆی لەئەركە شەرعییەكان بدزێتەوە، كارەكەی حەرامە و ئەركەكانیشی لەسەر لاناچن.

٢- كەسێك خۆی بەهەژار نیشان بدات و بكڕوزێتەوە و درۆ بكات تا خەڵكی خێری پێ بكەن، یان لەقەرزەكانیان، یان كرێی خانووەكانیان، یان نرخی كاڵاكانیان، یان حەقدەستی كارەكانیان خۆش بن، هەر پارەیەك بەو ڕێگیەیە پەیدا بكات حەرامە و دروست نییە.

٣- كەسێك بچێتە وڵاتێكی تر و لەوێ درۆ بكات تا مافی پەنابەرێتی پێ بدەن و بەخێوی بكەن، یان داوای باجی لێ نەكەن ، هەر مافێك لەسەر بنەمای ئەو درۆیە بەدەستی دەكەوێت حەرامە و دروست نییە.

٤- لە كاتی كڕین و فرۆشتندا كەسی فرۆشیار هەر عەیبێكی كاڵاكەی بشارێتەوە یان وەسفێكی زیادەی بكات كە تێیدا نییە، یان درۆ لە نرخەكەیدا بكات، و فێڵ لە كڕیارەكەی بكات، مامەڵەكەی حەرامە و دروست نییە.

ئەمانە و هەر فێڵێكی تر كە لە پێناو پچڕینی مافی خوای گەورە یان خەڵكیدا بكرێت لەهەر پەرستشێكدا یان مەمەڵەیەكدا حەرامە و دروست نییە.

## ڕێسای سی و شەش

## تبدل سبب الملك قائم مقام تبدل الذات

**واتە:** گۆڕانکاری هاتن بەسەر هۆکاری خاوەنداریێتیدا، وەك گۆڕنکاری هاتن وایە بەسەر خودی شتەکەدا.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە پێمان دەڵێت کە ئەگەر حوکمێکی دیاریکراومان دا بەسەر شتێکدا بەهەر هۆکارێك، پاشان خاوەنداریێتی ئەو شتە گوازرایەوە بۆ کەسێکی تر، ئەو کات حوکمەکەیشی دەگۆڕێت؛ چونکە گۆڕینی هۆکاری خاوەنداریێتییەکە وەك گۆڕینی خودی شتەکە وایە.

بۆ نموونە: خێر بە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ و بنەماڵەکەی ناشێت و ناشەرعییە، بەڵآم ئەگەر ئێمە خێرێکمان دا بەهەژارێك، ئەویش ئەو خێرەی بە دیاری دا بەکەسێك لە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ یان پێی فرۆشت، ئەو کات هیچ کێشەی نییە؛ چونکە ئێستا خاوەنداریێتی ئەو کەسەی خانەوادەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ ئەو شتە لەڕێی خێرەوە نەبووە، بەڵکو بە دیاری یان کڕین دەستی کەوتوە و ئەو دوو ڕێگەی خاوەنداریێتیەیش بۆ ئەو ڕێگە پێدراوە و ئێمەیش گوتومانە: گۆڕینی هۆکاری خاوەنداریێتی وەك گۆڕینی خودی شتەکە وایە.

بەڵام پێویستە ئاگامان لەوە بێت کە ئەم ڕێسایە ئەو شتانە ناگرێتەوە کە خاوەنداریێتییەکەیان لە ڕێگایەکی حەرام و ناشەرعییەوە بووبێت وەك دزی یان فێڵ یان ستەم یان دەستبەسەردا گرتن، خۆ ئەگەر لەیەکێك لەو ڕێگانەوە بوو، ئەو کات گۆڕینی خاوەنداریێتی شتەکە هەرچی و هەرچۆن و بۆ هەر کەس بێت، هەرگیز حەڵاڵی ناکات و هەر نادروستە. بۆ نموونە: کاڵایەکی دزراو، سەد ساڵی بەسەردا بڕواو سەد دەستیش بکات هەر حوکمی دزراوی هەیە ومامەڵە پێوەکردنی حەرامە و دروست نییە.

**سەرچاوە:** ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: {لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلَّا لِخَمْسَةٍ: الْعَامِلِ عَلَيْهَا، أَوْ غَارِمٍ، أَوْ مُشْتَرِيهَا، أَوْ عَامِلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ جَارٍ فَقِيرٍ يَتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، أَوْ أَهْدَى إِلَيْهِ}. (صحيح إبن خزيمة). واتە: زەكات بە دەوڵەمەند ناشێت جگە لە پێنج كەس نەبێت:

یەكەم: كەسێك كە كارمەندی دامەزراوەی زەكاتە و خۆی تەرخان كردوە بۆ كۆكردنەوە و دابەشكردن و كارەكانی زەكات.

دووەم: دەوڵەمەندێك كە هەموو پارەكەی گیراوە و لەقەرزدایە و هیچی بەدەستەوە نەماوە و قەرزارە، وەك ئەو هەموو بەڵێندەرانەی كە حكومەت پارەكەی گرتون، ڕاستە دەوڵەمەندن بەڵام پارەكانیان گیراوە.

سێیەم: كەسێك بە پارەی خۆی كاڵایەك یان موڵكێكی زەكات بكڕێتەوە.

چوارەم: كەسێك كە خۆی تەرخان كردوە بۆ غەزا كردن لە پێناوی خوادا وهیچ كاری تر ناكات.

پێنجەم: دراوسێیەكی هەژاری مەرێك یان ئاژەڵێك سەرببڕێت و بەشێكی بە خێر یان بەدیاری بۆ بنێرێت، یان هەر دیارییەكی تر كە دراوسێیەكی هەژاری یان هەر هەژارێك پێی بدات.

كەواتە دروست نییە پارەی زەكات بە هیچ دەوڵەمەندێك بدرێت وەك زەكات؛ بەڵام ئەگەر هۆكاری پێدان و خاوەندارێتییەكەی گۆڕا و وەك مووچە یان دیاریی یان كڕین یان هەژاری پێیدرا، ئەو كات دروستە وەری بگرێت و كێشەی نییە.

٢- خاتو عائیشە دەڵێت: (دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَالْبُرْمَةُ عَلَى النَّارِ، فَدَعَا بِطَعَامٍ، فَأُتِيَ بِخُبْزٍ وَأُدُمٍ مِنْ أُدُمِ الْبَيْتِ، فَقَالَ: {أَلَمْ أَرَ بُرْمَةً عَلَى النَّارِ فِيهَا لَحْمٌ؟!}. فَقَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، ذَلِكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَكَرِهْنَا أَنْ نُطْعِمَكَ مِنْهُ، فَقَالَ: {هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ مِنْهَا لَنَا هَدِيَّةٌ}..). (صحيح مسلم). واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە ژوورەوە و بنینی دەفرێك لەسەر ئاگرە، داوای خواردنی كرد، نانی وشك و هەندێك شۆرباو بۆ دانا، فەرمووی: دەفرێكم نەبینی لەسەر ئاگرەكە گۆشتی تیا بوو؟!، دەڵێت: گوتم بەڵێ ئەوە گۆشتی خێرە بۆ بەریرەی كارەكەرەكەی منیان هێناوە و پێمان ناخۆش بوو لەو گۆشتەت دەرخوارد بدەین.

فەرمووی: ئاسايیە ئەو گۆشتە بۆ بەریرە خێرە و بەئێمە ناشێت، بەڵام لەبەریرەوە بۆ ئێمە دیارییە و پێمان دەشێت.

كەواتە خودی گۆشتەكە حەرام نییە، بەڵآم هۆكاری خاوەنداریێتییەكەی حەڵاڵ یان حەرامی دەكات و بەخێر بە پێغەمبەر ﷺ نەدەشیا بەڵام بەدیاری هیچ كێشەی نییە.

٣- عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە فەرموودەیەكمان لە باوكییەوە بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (بَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، إِذْ أَتَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: إِنِّي تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِجَارِيَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ، قَالَ: فَقَالَ: {وَجَبَ أَجْرُكِ، وَرَدَّهَا عَلَيْكِ الْمِيرَاثُ}..). (صحيح مسلم). واتە: ڕۆژێكیان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوم، ئافرەتێك هاتە خزمەتی و پێی گوت، من كەنیزەكێكم بەخشیوە بە دایكم تا خزمەتی دایكم بكات، ئێستا دایكم مردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ چاكەی خۆتت كردووە و پاداشتی خۆت دەستكەوتووە و ئێستایش كە دایكت مردووە، كەنیزەكەكە بەمیرات بۆ خۆت دەگەڕێتەوە. ئێمە دەزانین كە كەسێك شتێكی بەخشی بۆی نییە داوای مافی خاوەندارێتی بكاتەوە و وەری بگرێتەوە؛ بەڵام لێرەدا هۆكاری خاوەندارێتییەكە گۆڕاوە كە میراتە بۆیە دروستە وەریبگرێتەوە.

**نموونە:**

١- ئەگەر كەسێك نەزرێكی كرد بۆ چاكبوونەوەی نەخۆشێك و گوتی: ئەگەر ئەو نەخۆشە چاك بوویەوە ئۆتۆمبێلەكەم نەزر بێت، بەڵام بەر لەچاك بوونەوەی نەخۆشەكە ئۆتۆمبێلەكەی فرۆشت، دواتر ئۆتۆمبێلەكەی بە میراتی یان وەك دیاری یان بە كڕین وەرگرتەوە و پاشتر نەخۆشەكە چاك بویەوە، ئێستا پێویست ناكات ئۆتۆمبێلەكە بكات بەنەزر؛ چونكە هۆكاری خاوەندارێتی ئۆتۆمبێلەكە گۆڕاوە و گۆڕانی هۆكاری خاوەندارێتیش وە گۆڕانی خودی شتەكە وایە؛ بۆیە لەئێستادا ئەو ئۆتۆمبێلە وا تەماشا ناكرێت كە ئۆتۆمبێلە كۆنەكەیە؛ بەڵكو وەك ئۆتۆمبێلێكی نوێ مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت. بەڵام بەمەرجێك كەسەكە بە فێڵ ئەمەی نەكردبێت و تەنها مەبەستی ئەوە بووبێت كە خۆی لەنەزرەكەی دەرباز بكات، خۆ ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە كردبووی ئەو كات نەزرەكەی لەسەر لاناچێت و پێویستە پێوەی پابەند بێت.

٢- پارەی سوو بەو کەسەی کە بە سووی داوە حەرامە و دروست نییە؛ بەڵام دروستە بیداتە خەڵکانی هەژار و نەدار؛ چونکە بۆ خاوەنەکەی سووە و وەرگرتنی دروست نییە؛ بەڵام بۆ هەژارەکان خێرە و وەرگرتنی دروستە، و گۆڕینی هۆکاری خاوەندارێتی وەك گۆڕینی خودی شتەکە وایە.

٣- ئەگەر کەسێك کەفارەتی سوێندی کەوتە سەر و لەبری کەفارەتەکەی پۆشاکی بۆ خەڵکی هەژارکڕی و دواتر هەژارەکە مرد و پۆشاکەکەی بەمیرات بۆ گەڕایەوە یان لە هەژارەکەی کڕیەوە بەنرخی بازاڕ، دروستە و کێشەی نییە و کەفارەتەکەی لەسەر لا دەچێت؛ چونکە ئەم بەهۆکارێکی تری شەرعی خاوەندارێتی پۆشاکەکەی بۆ گەڕاوەوتەوە، هەر وەك ئەوەی کە ئەو پۆشاکە پۆشاکەکەی پێشوو نەبێت.

٤- کەسێك وەسیەتی کرد پاش خۆی زەوییەکەی بکەنە مزگەوت، پێش مردنی خۆی و لەبەر هەژاری زەویەکەی فرۆشت، پاش ماوەیەك زەوییەکەی کڕیەوە، ئێسا ئەگەر بمرێت، زەویەکە وەسییەتەکەی لەسەر نەماوە و ناکرێت بە مزگەوت؛ چونکە هۆکاری خاوەندارێتییەکەی گۆڕاوە، وگۆڕینی هۆکاریش وەك گۆڕانی خودی شتەکە وایە.

بەڵام لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا پێویستە ئاگامان لەوە بێت، کە نابێت مەبەستی کەسەکە فێڵ کردن و خۆدەربازکردن بێت لە حوکمە شەرعییەکە، خۆ ئەگەر مەبەستی ئەوە بوو دروست نییە و حەرامە و دەبێت پابەند بێت بە وەسییەتەکەی یان نەزرەکەی.

## ڕێسای سی و حەوت

## التابع تابع

**واتە:** پاشكۆ هەمان حوكمی پێشگر و سەرچاوەكەی خۆی وەردەگرێت و وەك ئەو مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

**گرنگی:** ئەم ڕێسایە كار ئاسانییەكی زۆر بۆ مرۆڤەكان دەكات لە ڕووی ڕاییكردنی مامەڵەكانیانەوە، بەوەی كاتێك مامەڵە یان گرێبەست لەسەر شتێك یان كاڵایەك دەكرێت، هەرچی پەیوەست و تایبەت بێت بەو كاڵایەوە هەمان حوكمی ئەوی دەبێت لە گرێبەستەكەدا بەبێ ئەوەی ناوی بهێنرێت یان باس بكرێت.

جا چ پاشكۆكە بەشێكی دانەبڕاو بێت لە كاڵاكە، وەك زەوی لە خانو، یان بزوێنەر لە ئۆتۆمبێل، یان دووگ لە مەڕ، یان عاج لە فیل. یان بەچكەی ناو سك لە دایكەكەی، یاخود پاشكۆكە بەشێك بێت لە سیما و جوانكارییەكانی وەك دیكۆر بۆ خانو، یان باخچەی حەوشەكەی، یاخود پاشكۆكە ئەوەندە گرنگ بێت بۆ كاڵاكە كە بەبێ ئەو هیچ گرنگی نەمێنێت و سوودێكی ئەوتۆی نەبێت، وەك كلیل بۆ قفڵ یان بیر بۆ باخ، كارەبا بۆ شوێنی نیشتەجێبوون، هەموو ئەمانە ئەم ڕێسایە دەیانگرێتەوە و هەمان حوكمی خودی كاڵاكەیان بەسەردا جێبەجێ دەبێت لەكاتی هەر مامەڵە و گرێبەستێكدا.

**هۆكارەكانی پاشكۆبوون:**

پاشكۆبوون لە ڕێی چەند هۆكارێكەوە دروست دەبێت:

١- شەرع: هەندێك جار حوكمی شەرعی پاشكۆییەكە دروست دەكات و بڕیاری لەبارەوە دەدات. بۆ نموونە: لەبابەتی قوربانیدا ئەگەر ئەو كەسەی كەبەرپرسە لەدابینكردنی بژێوی خێزان قوربانی كرد، بەوە پەرستشەكە لە سەر سەرجەم ئەندامانی خێزانەكە لا دەچێت و قوربانی كەسی یەكەمی خێزانەكە بری هەموویان دەكەوێت، ئەمە بڕیاری شەرعە.

٢- زمان: هەندێك جاریش ئەو پاشكۆیەتییە زمانەوانی دروستی دەكات. بۆ نموونە: وشەی (نفس) لە بنەڕەتدا بە دەروونی مۆڤ دەگوترێت، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا مەبەست

پێی كۆی پێكهاتەی مرۆڤە بە سەرجەم ئەندامانی جەستەیەوە، هەر بۆیە كاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ﴾. (سورة المائدة: ٣٢). واتە: هەر كەسێك كەسێك بكوژێت بەبێ بەرامبەر، مەبەست پێی كوشتنی مرۆڤە بە ناهەق.

٣- نەریت: هەندێك جاریش هۆكاری پاشكۆبوونەكە داب و نەریتی كۆمەڵایەتییە، وەك پاشكۆبوونی ڕەشمە بۆ ولاخ، یان باخچە و ئاو كارەبا بۆ ماڵ.

سەرچاوە: ئەم ڕێسایە لە چەندین دەقی فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە لەوانە:

١- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {ذَكَاةُ الجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ}. (رواه أبو داود وإبن ماجة).

واتە: سەربڕینی دایك سەربڕینی بێچوەكەیشیەتی، مەبەست لە فەرموودەكە ئەوەیە: كاتێك مانگایەك سەر دەبڕین و گوێرەكەیەك لە سكیدایە، سەربڕینی دایكەكە دەبێتە سەربڕین بۆ گوێرەكەكە و گۆشتی گوێرەكەكەیش حەڵاڵە ئەگەرچی بەزیندوویش فریای سەربڕینی نەكەوتوین؛ چونكە گوێرەكەكە پاشكۆی دایكێتی و هەمان حوكمی ئەو وەردەگرێت لەسەربڕیندا.

٢- وە دەفەرموێت: {إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِنْ صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا}. (رواه البخاري). واتە: بۆیە پێشنوێژ دانراوە بۆ ئەوەی خەڵك چاوی لێبكات و شوێنی بكەوێت، كە پێشنوێژ (الله أكبر) ی كرد و دەستی بەنوێژ كرد، ئێوەش (الله أكبر) بكەن و دەست بەنوێژ بكەن، ئەگەر چووە ڕكوع ئێوەش لەگەڵی بچنە ڕكوع، ئەگەر كڕنوشی برد ئێوەش كڕنوش بەرن، وە ئەگەر بەپێوە نوێژی كرد ئێوەش بە پێوە نوێژ بكەن.

ڕێسا پەیوەندیدارەكان:

جگە لە ڕێسای (التابع تابع) چەندین ڕێسای ترمان هەیە كە پەیوەستن بەم ڕێسایەوە لەوانە:

١- (التابع لا يصح ورود الحكم عليه دون متبوعه). واتە: دروست نییە پاشكۆ مامەڵەی سەربەخۆی لەسەر بكرێت بەدەر لە پێشگر و سەرچاوەكەی، هەر وەك ئەوەی كەسێك بێچووی مەڕێك یان مانگایەك كە هێشتا كە لەسكی دایكەكەیدا بكرێت یان بفرۆشێت بەدەر لە دایكەكەی، ئەم مامەڵەیە حەرامە و دروست نییە.

٢- (لا يصح أن يتقدم التابع على متبوعه). واته: دروست نییه پاشكۆ پێش پێشگرەکەی بکەوێت. هەر بۆیه له نوێژی بەکۆمەڵدا دروست نییه هیچ نوێژخوێنێك له پێش مەلاوه بوەستێت و نوێژ بکات، یاخود له هەستان و دانیشتندا پێشی بکەوێت.

٣- (التابع يسقط بسقوط المتبوع). واته: هەر کات سەرچاوەو پێشگر نەما و حوکمەکەی هەڵوەشایەوه پاشگرەکەیش هەمان مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و حوکمەکەی هەڵدەوەشێتەوه؛ بۆیه ئەگەر کەسێك ویستی حەج بکات و نەیتوانی له عەرەفەدا بوەستێت، پێویست ناکات دواتر له مینا بمێنێتەوه و شەیتان ڕەجم بکات، چونکه ئەوانه پاشکۆی وەستانی عەرەفه و تەواوکاری پەرستشەکانی حەجن، ئێستا که وەستانی عەرەفه نەما حەجەکه بەتاڵ دەبێتەوه و هەموو پەرستشەکانی پاش خۆی هەڵدەوەشێنەوه و کەسەکه حەجەکەی واز لێدێنێت و عەمرەیەك تەواو دەکات.

٤- (ما كانت النية مطلوبة فيه فالعبرة فيه بنية المتبوع لا التابع). واته: لەهەر بابەتێکدا که نیەت تێیدا مەرجە و بەهەند وەردەگیرێت، نیەتی پێشگر و سەرچاوەکه مەرجه نەك پاشگرەکان، هەر بۆیه ئەگەر کەسێك چووه مزگەوتێکه و باران بوو، نەیدەزانی پێشنوێژ نیەتی کۆکردنەوەی نوێژەکانی هێناوه یان نا، یان لەسەفەردا که دڵنیا نەبوو پێشنوێژ نوێژەکانی کورت دەکاتەوه یان تەنها کۆیان دەکاتەوه. یان نەیدەزانی پێشنوێژ لەسەفەردایه و نوێژ کورت دەکاتەوه یان جێگیره و تەوای دەکات، له هەموو ئەو حاڵەتانەدا ئەم نوێژەکەی دەستپێدەکات و نییەتەکی هەواڵەی نیەتی پێش نوێژ دەکات و ئەو چیکرد ئەمیش وا دەکات و هیچ گرفتی نییه.

٥- (يحصل الملك للتابع بملك المتبوع). واته: هەر کەس بوو بەخاوەن سەرچاوه و بنەڕەتی شتێك دەبێته خاوەنی سەرجەم پاشکۆکانیشی. بۆ نموونه: کەسێك خانوو یان باخێکی کڕی دەبێته خاوەنی هەموو ئەو شتانەیش که تێیدایه له دەرگا و پەنجەره و گڵۆپ و بیری ئاو و هتد.

٦- (عند الاختلاف بينهما العبرة للمتبوع لا للتابع). واته: ئەگەر حوکمی پاشگر لەگەڵ حوکمی پێشگر و سەرچاوەکەیدا جیاواز بوو، کار به حوکمی پێشگرەکەی دەکرێت ناك پاشگرەکەی، بۆ نمونه: ئەگەر پەرداخێك یان دەفرێك له ئاڵتون یان زیو

دروستکرابوو خواردن و خواردنەوە تێیدا حەرامە و دروست نییە، ، بەڵام ئەگەر پەرداخەکە یان یان دەفرەکە لە شووشە یان قوڕ یان سیرامیك دروستکرابو بەڵام دواتر بەهۆی شکانەوە بە ئاڵتون یان زیو پینەکرابوو، ئەو کات بەکارهێنانی حەڵاڵەو دروستە، چونکە کانزای پەرداخەکە

یان دەفرەکە لەبنەڕەتدا بەکارهێنانی حەڵاڵە و دروستە و پینەی ئاڵتونەکە پاشگرە و لەکاتی جیاوازی حوکمی پاشگرو سەرچاوەدا کار بە حوکمی سەرچاوە و پێشگرەکە دەکرێت نەك پاشگرەکە.

٧- (لا يكون المتبوع تابعا لتابعه فينقلب المتبوع تابعا والتابع متبوعا). واتە: حوکمی پێشگر هیچ کاتێك نابێتە پاشگر و پاشکۆی پاشگرەکەی خۆی، بەشێوەیەك کە هاوکێشەکە پێچەوانە بێتەوە و پێشگر حوکمی پاشگرەکەی وەربگرێت، بەڵکو بەردەوام حوکمی پێشگر سەرچاوەیە بۆ حوکمی پێشگر و هاوکێشەکە پێچەوانە نابێتەوە. هەر وەك ئەو نموونانەی پێشتر باسمان کردن.

نموونە:

١- ئەگەر کەسێك داری بەرداری فرۆشت بەر لەوەی بەرەکەی لێبکاتەوە، ئەوە بەرەکەی پاشکۆی دارەکانە و بەفرۆشراو ئەژمار دەکرێت و بەشێکە لە گرێبەستەکە؛ بەڵآم ئەگەر پاش لێکردنەوەی بەرەکەی دارەکانی فرۆشت ئەو کات بەرەکەی بەشێك نییە لە گرێبەستەکە و بەفرۆشراو ئەژمار ناکرێت.

٢- منداڵ هەتا پێدەگات لە ڕووی ئاینەوە و لە زۆرێك لەمامەڵە دونیاییەکاندا، هەمان حوکمی باوك و دایکی دەبێت بۆ نموونە: ئەگەر باوك و دایکی مەسیحی بوون منداڵەکە وەك مەسیحی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت لەڕووی ناو و ڕەچەڵەك و ڕێو ڕەسمی ناونان و مردن و بەخاك سپاردن و هتد؛ چونکە منداڵەکە خۆی توانای بژاردەکردن و بڕیاردانی نییە؛ بۆیە هەمان حوکمی ئەوان وەردەگرێت لە بابەتە دونیاییەکاندا، بەڵآم سەبارەت بە قیامەت هیچ منداڵێك وەك بێباوەڕ مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت و بەتاوانی باوك و دایکی سزا نادرێت.

٣- مندالّی دۆزراوه حوكمی ئەو شوێنه وەردەگرێت كه لێی دۆزراوەتەوە، ئەگەر لەناوچەیەكی موسوڵمان نشین دۆزرایەوە، ئەوە حوكمی موسوڵمانی دەبێت، ئەگەریش لەناوچەیەكی مەسیحی نشین بوو، ئەوه وەك مەسیحی مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

٤- لەبابەتی كەفالەتدا ئەگەر كەسی قەرزار خۆی قەرزەكەی دایەوە، ئەو كات كەفیلەكەیشی ئەستۆ پاك دەبێت له كەفالەتەكەی.

٥- له بابەتی بەیعەتدا به خەلیفەی موسوڵمانان ئەگەر ئەنجومەنی ڕاوێژكاری هەلبژێردراو بەیعەتیان پێدا ئەوە وەك ئەوە وایه كه هەموو میللەت بەیعەتیان پێدابێت.

هەموو ئەمانه و سەدەها نموونەی ترمان هەیه كه لەسەر ڕێسای (التابع تابع) دامەزراوە و كاری پێ دەكرێت.

## كۆتایی

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری باڵا دەست، درودو ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پاكی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ و یارو یاوەران و شوێنكەوتوانی بەگشتی.

بەڕێزان ئەم پەڕتووكە گرنگترین ئەو ڕێسا فیقهییانە لە خۆ دەگرێت كە كۆكاری هەزارەها بابەتی شەرعیین و ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆر پێویستیمان پێیەتی و بەشوێن حوكمەكانیدا وێڵین، بە تایبەتی ئەو پێنج ڕێسا گشتییەی كە بە بنچینە دادەنرێن بۆ زۆرێك لە ڕێسا فیقهییەكانی تر كە ئەوانیش ڕێساكانی: (الأمور بمقاصدها، اليقين لايزول بالشك، المشقة تجلب التيسير، لا ضرر و لا ضرار، العادة محكمة).

بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی واتا و مەبەستی هەر یەك لەوانەیش سەرجەم ئەو ڕێسایانەم باس كردوە كە پەیوەستن پێیانەو، بۆ نموونە:

بۆ ڕێسای (الأمور بمقاصدها) باسم لەهەر یەك لە ڕێساكانی: (النية تتبع العلم، من استعجل شيئا قبل أوانه عوقب بحرمانه، نية المؤمن خير من عمله، مجرد النية لا عبرة به في أحكام الشرع، مقاصد اللفظ على نية اللافظ، الصريح لا يحتاج إلى النية والكناية لا تلزم إلا بالنية، اليمين على نية المستحلف). كردوە.

بۆ ڕێسای: (اليقين لايزول بالشك) باسم لەهەر یەك لە ڕێساكانی: (ما ثبت بيقين لا يرتفع إلا بيقين، الأصل فى الأشياء الإباحة، الأصل في العبادات المنع، الأصل بقاء ماكان على ماكان، الأصل براءة الذمة). كردوە.

بۆ ڕێسای: (المشقة تجلب التيسير). باسم لەهەر یەك لە ڕێساكانی: (لاتكليف إلا بمقدور، الأجر على قدر المشقة، الرخص لا تناط بأمر موهوم، لا حرج في النوادر، الرخص لا تناط بالمعاصي، الضرورات تبيح المحظورات، الضرورات تقدر بقدرها، ما جاز لعذر بطل بزواله، إذا زال المانع عاد الممنوع، الدوام كالإبتداء، الحاجة العامة تنزل منزلة الضرورة الخاصة، لا واجب مع العجز، القادر بقدرة الغير ليس بعاجز). كردوە.

بۆ ڕێسای: (لا ضرر و لا ضرار). باسم لەهەر یەك لە ڕێساكانی: (الضرر يزال، الضرر لا يزال بمثله). كردوە.

بۆ ڕێسای: (العادة محكمة). باسم لەهەر یەك لە ڕێساكانی: (المعروف عرفا كالمشروط شرطا، الثابت بالعرف كالثابت بالنص، العرف إنما يعتبر إذا كان مقارنا لا لاحقا). كردوە.

سەربارى ئەو پێنج ڕێسا گشتییە باسم لە كۆمەڵە ڕێسایەكەی تر كردوە كە زۆر گرنگن چ لەڕووی شەرعییەوە، چ لە ڕووی پەیوەستبوونیان بە ژیانی ڕۆژانەی هەریەكەمانەوە هەر وەك ڕێساكانی:

(المعدوم شرعا كالمعدوم حسا، لا حكم للباطل، مابني على الباطل فهو باطل).

(إذا اجتمع الحلال والحرام غلب الحرام، الحكم يبنى على الظاهر).

(الاجتهاد لا ينقض بمثله، لا إجتهاد في مورد النص، المجمع عليه ليس محلا للإجتهاد، لا عبرة بالظن البين خطؤه).

(العقد شريعة المتعاقدين، مقاطع الحقوق عند الشروط، الأصل في الشروط الجواز إلا ما دل الشرع على تحريمه، الملحق بالعقد يعد واقعا فيه، الوعد لا ينعقد به العقد، العقد يبطل بهلاك المعقود عليه، يبطل العقد ما يمنعه ابتداء، الشروط تعتبر في الدوام كاعتبارها في الابتداء، يغتفر في الدوام ما لا يغتفر في الابتداء، العبرة في العقود للمقاصد والمعاني لا للألفاظ والمباني، العبرة بالمسميات لا بالأسماء، إعمال الكلام أولى من إهماله).

(الحقوق إذا تقررت لأربابها لا تسقط إلا بالأداء أو الإبراء، كل حق تعلق بالعين تعلق ببدلها إذا لم يبطل سبب استحقاقها، إسقاط الحق قبل وجود سببه لا يصح، التصرف إذا لم يصادف محله يكون لغوا، الحق لا يسقط بتقادم الزمان، حق العبد لا يتوقف على القصد، يمينك على ما يصدقك به صاحبك، الجواز الشرعي ينافي الضمان، لا ضمان على مؤتمن، المفرط ضامن، من أودع وديعة فلا ضمان عليه، الإحتيال على إبطال الحقوق الثابتة حرام، تبدل سبب الملك قائم مقام تبدل الذات).

(التابع تابع، التابع لا يصح ورود الحكم عليه دون متبوعه، لا يصح أن يتقدم التابع على متبوعه، التابع يسقط بسقوط المتبوع، ما كانت النية مطلوبة فيه فالعبرة فيه بنية المتبوع لا التابع، يحصل الملك للتابع بملك المتبوع، عند الاختلاف بينهما العبرة للمتبوع لا للتابع، لا يكون المتبوع تابعا لتابعه فينقلب المتبوع تابعا والتابع متبوعا).

بەوردی لەسەر واتا و گرنگی هەر یەك لەو ڕێسایانە هەڵوێستەم كردوە و سەرچاوە شەرعییەكانیانم خستۆتە ڕوو و دواتریش چەندین نموونەی واقیعیم لەبارەیانەوە باس كردوە.

لە كۆتاییدا ماوە ئەوە بڵێین كە زانستی ڕێسا فیقهییەكان یەكێكە لەو زانستە پڕ پێز و بەهێزانەی كە پێویستە هەموو تاكێكی موسوڵمان زانیاری دەربارەی هەبێت بەتایبەتی خەڵكانی شەرعزان و یاساناس كە ئەوان زیاتر سەرقاڵی داڕشتنەوەو هەڵسەنگاندنی حوكمە شەرعی و یاساییەكانن و ڕۆژانە كاریان لەسەر دەكەن و وەڵامی پرسیارەكانی خەڵكی دەدەنەوە؛ هەر بۆیە گرنگە ئەم زانستە برەوی زیاتری پێ بدرێت و بكرێتە پێڕوە لەكۆی فێرگەو كۆلیجە شەرعی و یاساییەكاندا.

داواكارم لە قاپی ڕەحمەتی پەروەردگار ئەم هەوڵە كەم و كورتە بەگەورەیی خۆی قبوڵ بفەرموێت و بیكاتە توێشووی قیامەتی بەندە و هەموو ئەو بەڕێزانەی كە بەشێوەیەك لە شێوەكان پێوەی ماندوو بوون، وە هەرچی ڕاستی و باشە كە باسم كردوە ئەوە بەخششی خوای گەورەیە و لەوەوەیە و هەرچیش كەم و كورت و خراپە ئەوە لەمن نەفسی بەد و شەیتانەوەیە و پاك و بێگەردی تەنها بۆ خوای گەورەیە.

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**

# پێرستی سەرچاوەکان

**قورئانی پیرۆز.**

**سەرچاوەکانی فەرموودە.**

١. أحمد بن حنبل، المسند، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٤٢١هـ - ٢٠٠١م، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، عادل مرشد، وآخرون، إشراف: د عبد الله بن عبد المحسن التركي.

٢. البخاري (محمد بن إسماعيل أبو عبد الله البخاري)، صحيح البخاري (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله ﷺ وسننه وأيامه)، دار طوق النجاة، ط١، ١٤٢٢هـ، تحقيق: محمد زهير بن ناصر الناصر، الناشر: شرح وتعليق د. مصطفى ديب البغا.

٣. البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي بن موسى)، السنن الكبرى للبيهقي، مجلس دائرة المعارف النظامية الكائنة في الهند ببلدة حيدر آباد، دار الفكر، ط١، ١٣٤٤ هـ.

٤. الترمذي (محمد بن عيسى) سنن الترمذي، دار الفكر للطباعة والنشر، تحقيق: عبد الوهاب عبد اللطيف.

٥. إبن حبان (محمد بن حبان)، صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٢، ١٤١٤ .

٦. تحقيق: شعيب الأرنؤوط

٧. إبن خزيمة (أبو بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة)، صحيح ابن خزيمة، تحقيق: محمد مصطفى الأعظمي، المكتب الإسلامي، بيروت.

٨. الدارقطني (علي بن عمر)، سنن الدارقطني، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١، ١٤٢٤ هـ.

٩. عبد الرزاق (أبو بكر عبد الرزاق)، المصنف، المجلس العلمي، الهند، ط٢- ١٤٠٣، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي.

١٠. أبو داود (سليمان بن الأشعث)، سنن أبي داود، دار الرسالة العالمية، ط١، ١٤٣٠ هـ - ٢٠٠٩م، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، محمد كامل قره بللي.

١١. مسلم (مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري)، المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله ﷺ، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

١٢. ابن ماجة (أبو عبد الله محمد بن يزيد القزويني)، سنن ابن ماجة، دار إحياء الكتب العربية، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

١٣. النسائي (أحمد بن شعيب)، المجتبى من السنن (السنن الصغرى للنسائي)، مكتب المطبوعات الإسلامية، حلب، ط٢، ١٤٠٦ – ١٩٨٦، تحقيق: عبد الفتاح أبو غدة.

١٤. النووي (محيي الدين يحيى بن شرف النووي)، المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ط٢، ١٣٩٢.

سەرچاوەكانی ڕێسا فیقهیەكان:

١٥. أحمد محمد الزرقا، شرح القواعد الفقهية، دار القلم، دمشق، ط٢، ١٤٠٩هـ - ١٩٨٩م.

١٦. الزركشي (محمد بن عبد الله)، المنثور في القواعد الفقهية، وزارة الأوقاف الكويتية، ط٢، ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م.

١٧. السيوطي (عبد الرحمن بن أبي بكر)، الأشباه والنظائر، دار الكتب العلمية، ط١، ١٤١١هـ.

١٨. صالح بن محمد بن حسن، مجموعة الفوائد البهية على منظومة القواعد الفقهية، ط١، ١٤٢٠ هـ - ٢٠٠٠م، دار الصميعي للنشر والتوزيع، المملكة العربية السعودية.

١٩. القرافي (أحمد بن إدريس)، الفروق (أنوار البروق في أنواع الفروق)، عالم الكتب.

٢٠. محمد صدقي، موسوعة القواعد الفقهية، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط١، ١٤٢٤ هـ.

٢١. د. محمد مصطفى الزحيلي. القواعد الفقهية وتطبيقاتها في المذاهب الأربعة، دار الفكر، دمشق، ط١، ١٤٢٧ هـ- ٢٠٠٦م.

٢٢. إبن نجيم (زين الدين بن إبراهيم بن محمد)، الأشباه والنظائر، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١٩هـ- ١٩٩٩م، تحقيق: زكريا عميرات.

**سەرچاوەی جیاواز:**

٢٣. الغزالي (أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي)، المستصفى في علم الأصول، مؤسسة الرسالة، بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤١٧ هـ/١٩٩٧م، تحقيق: محمد بن سليمان الأشقر

٢٤. محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية، إعلام الموقعين عن رب العالمين، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٩٩١م، تحقيق: محمد عبد السلام إبراهيم.

٢٥. إبن الهمام (محمد بن عبد الواحد السيواسي)، فتح القدير، دار الفكر، ب ت ط.

٢٦. وهبة الزحيلي، التفسير المنير في العقيدة والشريعة والمنهج، دار الفكر المعاصر، دمشق، ط٢، ١٤١٨ هـ.

# پێڕستی بابەتەکان

# پێناسی کتێب

بەڕێزان زانستی ڕێسا فیقهییەکان یەکێکە لەو زانستە پڕ پێز و بەهێزانەی کە پێویستە هەموو تاکێکی موسوڵمان زانیاری دەربارەی هەبێت بە تایبەتی خەڵکانی شەرعزان و یاساناس کـە ئـەوان زیاتـر سەرقاڵی داڕشتنەوە و هەڵسەنگاندنی حوکمە شەرعی و یاساییەکانن و ڕۆژانە کاریان لەسەر دەکەن و وەڵامی پرسیارەکانی خەڵکی دەدەنەوە.

سەرەڕای گرنگی زانستەکە بەڵام بەداخەوە کتێبخانەی کوردی هیچ سەرچاوەیـەکی لەسەر ئەو بابەتە تێدا نییە؛ بۆیە ئەم پەڕتووکە هەوڵێک و دەلاقیەکە بۆ ئاشناکردنی خوێنەر و خوێندکاری کورد بەو زانستە مەزنە کە یەکەم پەڕتووکە لەسەر ئەو بابـەتە دەنوسرێت.

پەڕتوکەکە گرنگترین ئەو ڕێسا فیقهییانە لە خۆ دەگرێت کە کۆکاری هەزارەها بابەتی شـەرعیین و ئـێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆر پێویستیـمان پێـیەتی و بـە شوێن حوکمەکانیدا وێڵین، بە تایبەتی ئەو پێنج ڕێسا گشتییەی کە بە بنچینە دادەنرێـن بۆ زۆرێک لە ڕێسا فیقهییەکانی تر کە ئەوانیش ڕێساکانی: (الأمور بمقاصدها، اليقين لا يزول بالشك، المشقة تجلب التيسير، لا ضرر و لا ضرار، العادة محكمة).

بـۆ زیـاتـر ڕوونکردنەوەی واتا و مەبەستی هەریەک لەوانەیش سەرجـەم ئـەو ڕێسایانەم باسکردوە کە پەیوەستن پێیانەوە و بەشێوەیەکی گشتی پەڕتووکەکە **(٧٧)** ڕێسای فیقهی و زیـاتر لە **(٥٣٥)** حوکمی شـەرعی لە بابەتە فیقهییە جیاوازەکاندا لەخۆ دەگرێت.